# زار و زمان

د. نەریمان عەبدوڵڵا خۆشناو

چاپی دووەم

زیادکراو و پوختکراو

2014

* ناوی کتێب: زار و زمان

* نووسینی: د.نەریمان عەبدوڵڵا خۆشناو

* تایپێست: کۆچەر ئەنوەر

* دیزانین : سۆران عەبدولرەحمان

* چاپ: دووەم ٢٠١٤

* چاپخانە: چاپخانەی هێڤی/ هەولێر

* تیراژ: ١٠٠٠ دانە

* نرخ : ٤٠٠٠ دینار

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی(١٢٠١)ی ساڵی ٢٠١١ی پێدراوە.

لە بڵاوکراوەکانی ناوەندی ئاوێر

## ناوەرۆك

# پێشەکی

نووسین یان ئامادەکردنی هەر کتێبێك پێویستی بە کۆمەڵێك ڕەهەندی مەعریفیی یان زانستیی هەیە، کە بە هۆیەوە نووسەر ناچار دەکات پشتیان پێ ببەستێت، بەو واتایەی نووسین شتێکی ئەوەندە ئاسان نییە، وەکو هەندی لە برادەران بیری لیدەکەنەوە، بەبێ ئەوەی ڕۆژێ کتێبێکیان دەرکردبێت، بەڵکو هەر خەریکی ڕەخنەگرتنن لەو کەسانەی کە کتێب دەنووسن، بەندە لە ماوەی ڕابوردوودا توانی بەپاڵپشتی خوای گەورە سی و دوو کتێب بە چاپ بگەیەنێت، دیارە ئەم ژمارەیەش کەم نییە، کەچی هەندێ لە برادەران لەجیاتی دەستخۆشی کردن، کەچی لەملاو و لەولا قسە و قسەلۆك دەکەن، بە بێ ئەوەی بتوانن ڕەخنەیەکی زانستیی بگرن، بەڵکو هەموو قسەکانیان لە دوو شت کۆدەبێتەوە: یەکەمیان نووسەکان سادە و ساکارن. دووەمیان زۆری ژمارەی کتێب.

بەندە هەر لە سەرەتاوە بڕیاری ئەوەم داوە کە تەنیا خزمەتی زمانەکەم بکەم و خۆم بەم شتانە خەریك نەکەم، ئەو برادەرانەش دەتوانن بەهۆی بەرهەمەکانیان خزمەتێك بە زمانەکەیان بگەیەنن و ململانێی زانستی من بکەن، ئەگەر بتوانن بیکەن، بەڵام بەدڵنیاییەوە کاتیان بۆ ئەم بوارە نییە و نایکەن.

ئەم کتێبەی ئەمجارەمان لە دوو بەشی سەرەکی پێکدێت، زمان و زار، کە تێیدا هەموو لایەنەکانی زمان و زارمان خستۆتەڕوو. دیارە ئەم کتێبە وەکو سەرەتایێك بۆ وانەکانی زارەکانی قۆناغی یەکەم و زارەکانی قۆناغی دووەم و زمانەوانی قۆناغی چوارەم زۆر پێویستە، چونکە زۆرینەی لایەنەکانی پرۆگرامی ئەم سێ وانەیەی قۆناغەکانی زانکۆی گرتۆتەوە.

# بەشی یەکەم: زمان

## ١ـ١: پێناسەی زمان

کۆزمانەوانەکان لە بەرانبەر پێناسەی زمان، دەستەوەستان دەوەستن، پێیان وایە کە زمان لە پێناسە نایەت و خۆیان زیاتر بە بیرۆکەی کۆمەڵەی زمان دەبەستنەوە، لەلای ئەمان کۆمەڵەی زمان ئەو کۆمەڵە خەڵکەیە کە هەست دەکەن بە یەك زمان دەدوێن، بەم پێیە هۆڵەندی و ئەڵمانی دەبنە دوو زمانی جیاواز، چونکە لەگەڵ ئەو هەموو لێکچوونە لە پێکهاتی دوو زمانەکەدا، هێشتا هۆڵەندییەکان وا هەست دەکەن، کە زمانەکەیان لە ئەڵمانی جیاوازە، هەروەها ئەڵمانەکانیش خۆیان بە جیاواز دەزانن، بەم پێیە هەموو دیالێکتەکانی (چین) بەبێ جیاوازی یەك زمانن، چونکە خەڵکی چین وا هەست دەکەن، کە بە یەك زمان دەدوێن، بەم پێیە هەموو دیالێکتەکانی کوردی بەبێ گوێدان بە جیاوازی لە پێکهاتەی دەنگسازی و وشەسازی و ڕستەسازی و واژەدا، هەموویان کاتێ بە زمانی کوردی دادەنرێت، کە ئەو خەڵکەی قسەیان پێ دەکەن (هەست) بکەن بە یەك زمان، ئەویش زمانی کوردییە قسە دەکەن[1]. بەمپێیە تاکو ئێستا چەندین پێناسەی جیا جیا لەبارەی زمانەوە خراونەتەڕوو، بەجۆرێك هەریەك لەم پێناسانە لە ڕوانگەیەکی تایبەتییەوە لە زمانیان کۆڵیوەتەوە، لێرەدا هەندێك لەو پێناسانە دەخەینەڕوو:

---

[1] - محمد معروف فتاح(د)(٢٠٠٨)، زمانی ستاندەرد و زمانی یەکگرتووی کوردی، دەستنووس، ئەکادیمیای کوردی، ل ٣ — ٤.

فردیناند دی سۆسێر دەڵێت:((زمان بەرهەمی کۆمەڵایەتی هاوزمانانە و کۆمەڵە ئاکارێکی زۆر پێویستە، کە کۆمەڵ دایهێناوە، بۆ ئەوەی لە بەکارهێنانیدا یارمەتی تاکەکانی بدات))[1].

چۆمسکی دەڵێت:((زمان کۆمەڵە ڕستەیەکە، ڕێزمان دەریان دەکات))[2].

هۆڵ دەڵێت:((زمان فەرمانگەیەکە خۆی و بەڕێوەبردنی خۆی لە دەست خۆیدایە، لەڕێی فەرمانگەکەوە مرۆڤەکان لەگەڵ یەکتردا کاردەکەن و لە یەکتر دەگەن))[3].

بلۆك و تراگەر دەڵێن:((زمان بریتییە لە چەند ڕەمزێکی لەخۆوە، کە بەهۆیەوە کۆمەڵ دەتوانێ هەرەوەزی بکات))[4].

ساپیر دەڵێت:((زمان هۆیەکی ناغەریزی تایبەتە بە مرۆڤ، بۆ دەربڕینی هەست و ئارەزوو بەکاردێت، بەهۆی ڕەمزی لەسەر یاسا ڕۆیشتووەوە کاردەکات و لەژێر دەسەڵاتی مرۆڤدایە))[5].

فوئاد مەرعی دەڵێت:((زمان سیستەمێکی هێمایی سەربەخۆیە، لەناو کۆمەڵدا لەخۆوە سەرهەڵدەدات و بۆ مەبەستی لەیەکترگەیشتن لە نێوان تاکەکانیدا بەکاردێت))[6].

محەمەد عەلی خولی ئەم پێناسانەی بۆ زمان کردووە[7]:-

---

1- فردیناند دی سوسور (١٩٨٨)، علم اللغة العام، ترجمة یوئیل یوسف عزیز، الموصل، ص ٢٧.

2- محمد معروف فتاح(١٩٩٠)، زمانەوانی، چاپخانەی (دار الحکمة)، بەغدا، ل ٥.

3- محەمەد مەحوی(د)(٢٠٠١)، زمان و زانستی زمان ـ سەرەتایەك بۆ زانستی زمان، بەرگی یەکەم، سلێمانی، ل ١١.

4- محمد معروف فتاح(١٩٩٠)، هەمان سەرچاوە، ل ٥.

5- هەمان سەرچاوە، ل ٥.

6- فؤاد مرعي (٢٠٠٢)، في اللغة و التفكیر، دار المدى للثقافة و النشر، دمشق، ص ٧.

7- محمد على الخولي(د)(٢٠٠٠)، مدخل الى علم اللغة، دار الفلاح للنشر والتوزیع، عمان ـ اردن، ص ١٢.

((زمان سیستەمی پەیوەندیکردنە لە نێوان دوو لا)).

((زمان سیستەمێکە بۆ ئاڵوگۆڕکردنی هەست و بیرەکان لە نێوان خەڵکدا بەکاردێت)).

((زمان هۆکارێکە بۆ گوزارشتکردن لە پێویستیی و بۆچوون و ڕاستییەکان لەنێو خەڵکدا)).

((زمان سیستەمێکی لەخۆوەیە بۆ ڕەمزەکانی دەنگ و، بۆ ئالوگۆڕکردنی بیرو هەستەکان لەنێوان ئەندامانی کۆمەڵێکی زمانەوانی هاوچەشن بەکاردێت)).

مارتنێت دەڵێت:((زمان هۆیەکە بۆ لەیەکترگەیشتن، دەکرێت بە چەند دانەیەکی وردەوە (مۆرفیم)، کە هەر یەکەیان خاوەنی واتا و فۆرمن))[1].

کارۆڵ دەڵێت: ((زمان کۆمەڵە ڕەمزێکی دەنگی لەخۆوەیە، کە دەتوانرێ بۆ گەیشتن و پۆلکردنی شت و ڕووداوەکانی دەوروبەر بەکاربێت))[2].

ئۆلمان دەڵێت:((سیستەمێکی هێمایی دەنگییە، لەبیری کەسی کۆمەڵ تۆمارکراوە))[3].

هنری سویت دەڵێت:((زمان هۆیەکە بۆ دەربڕینی بیر لەڕێگەی دەنگ، کە لە وشە پێکدێت))[4].

ئەحمەد مەتلوب دەڵێت:((زمان ئەو دەنگانەیە، کە هەموو نەتەوەیەك بۆ پێداویستییەکانی دەری دەبڕێت))[1].

---

1- محمد معروف فتاح(١٩٩٠)، هەمان سەرچاوە، ل ٥.

2- هەمان سەرچاوە، ل ٥.

3- ستيفن اولمان (١٩٨٦)، دور الكلمة فی اللغة، ت. كمال محمد بشير، مكتبة شباب، بغداد، ص ٣٣.

4- حاتم صالح الضامن (١٩٨٩)، علم اللغة، طبعة الاولى، وزارة التعليم العالي والبحث العلمي، بيت الحكمة، بغداد، ص ١٣٢.

ئەرستۆ دەڵێت:((زمان ئاوێنەی ڕاستەقینەی عەقڵە))[٢].

محەمەد شەفیق غوربال دەڵێت:((زمان دیاردەیەکی کۆمەڵایەتییە و هۆکارێکە لە گرنگترین هۆکارەکانی تێکەڵبوونی نێوان مرۆڤەکان))[٣].

محەمەد محەمەد یونس عەلی دەڵێت:((زمان سیستەمێکە لە نیشانە، لەخۆوە لەسەری ڕێککەوتووین، توانای دابەشکردنی هەیە، تاکەکەس وەك ئامرازێك بۆ دەربڕینی مەبەستەکانی و بۆ پەیوەندیکردن بە کەسانی دیکەوە لە ڕێگەی ئاخاوتن و نووسین بەکاریدێنێت))[٤].

لەڕوانگەی کۆزمانەوانییەوە:((زمان کۆمەڵە شێوەزارێکی جیاوازە، هەریەکەیان بۆ بارێکی تایبەتی دەست دەدات))[٥].

ـ زمان ئاخاوتنی مرۆڤە، بە دەربڕین یان نووسین[٦].

دێڤید لویس دەڵێت:((زمان بریتییە لە تێکەڵاوکردنی ڕستە و واتا لە چوارچێوەیەکی بێکۆتایدا))[٧].

---

[1]- احمد مطلوب (د)(١٩٨٩)، معجم النقد العربي القديم، بغداد، ص ٢١٦.

[2]- التهامي الراجي(د)(١٩٨٦)، توطئة لدراسة علم اللغة التعاريف، بغداد، ص ٤٥.

[3]- محمد شفيق غربال (١٩٨٠)، الموسوعة العربية الميسرة، الجزء ٢، دار النهضه، لبنان، ص ١٥٧.

[4]- محەمەد محەمەد یونس عەلی(د)(٢٠١٠)، دەروازەیەك بۆ زمانەوانی، و: نەریمان عەبدوڵڵا خۆشناو، لە بڵاوکراوەکانی کتێبخانەی ئاوێر، چاپخانەی ڕۆژهەڵات، هەولێر، ل ٢٨.

[5]- محمد معروف فتاح، هەمان سەرچاوە، ل ٥.

[6]- الموسوعة العربية العالمية (١٩٩٩)، الطبعة الثانية، مؤسسة اعمال الموسوعة للنشر والتوزيع، الرياض، ص ١٢٢.

[7]- نعوم تشومسكي (١٩٩٣)، المعرفة اللغوية (طبيعتها وأصولها واستخدامها)، ترجمة: محمد فتيح، الطبعة الاولى، دار الفكر العربي، القاهرة، ص ٧٨.

جومعە سەید یوسف دەڵێت:((زمان سیستەمێکی دەنگی درکێنراوە، ڕێسای تایبەت بە خۆی هەیە، کە ئاستە جیاجیاکانی (دەنگسازی، وشەسازی، ڕستەسازی) بەڕێوە دەبات، بە شێوەیەکی یەکگرتوو و بەتین کاردەکات، بۆیە زمان سیستەمی سیستەمەکانە))[1].

کەواتە زمان کۆمەڵە شێوازێکی جیاوازە، هەریەکەیان بۆ بارێکی تایبەتی دەست دەدات، بۆ نموونە باری پێشوازی کردن و باری بەڕێوەبردن و باری بەڕێکردنی میوان، لەلایەکی ترەوە زمان بە پێی ڕەگەز و چین و توێژی کۆمەڵایەتی و تەمەن و نێوەندەکان دەگۆڕێت، لێرەشدا بۆنە و گروپە کۆمەڵایەتییەکە و تەمەن، جۆری زمانەکە دەسەپێنێ، بە واتای ئەوەی گروپی کۆمەڵەکە جۆری یەکە فەرهەنگییەکان دەسەپێنێ، بە واتای ئەوەی کەلتوور و شوێنەوار و ژینگەی خەڵکەکە، جۆری زمانەکە دیاریدەکات[2].

کەواتە زمان تەنها کەرەستەیەك نییە بۆ ناردن، وەرگرتن و لێتێگەیشتنی پەیامی نێوان مرۆڤەکان، بەڵکو دیسان زمان کەرەستەی ناسین و ناساندنی تاك و کۆیە بۆ هەر شوێن و دەمێك، لە دەوروبەری ئێمەدا هەزاران زمان و دیالێکت هەیە، کە گوزارشت لە جۆرەها بۆچوونی هزریی، کۆمەڵایەتی، چینایەتی، ڕەگەزی، وێژەیی، شێوازی ژیان... دەکەن، زمان دیاردەیەکی کەلتوورییە، بۆیە گەلێك پەیوەستە بە بونیادی کۆمەڵایەتی و بەهاکانی سیستەمی کۆمەڵگا[3].

---

1- جمعة سيد يوسف (١٩٩٠)، سيكولوجية اللغة والمرض العقلي، سلسلة عالم المعرفة، الكويت، ص ٥٧.

2- محمد معروف فتاح(١٩٨٥)، هێماکاری و زمانەوانی، گ. کاروان، ژ(٢٨)، ل ١٠٧.

3- غازی عەلی خورشید (٢٠١١)، زمان و زمانی ستاندارد بۆ کورد، بەشی یەکەم، ڕ. ئاسۆ، ژ.(١٥٢٨)، سێشەممە ٢٠١١/٧/٩، ل ١٤.

## ٢.١ :ئەرکەکانی زمان

مەبەست لە ئەرکەکانی زمان، ئەو کارانەن کە مرۆڤ بە هۆی زمانەوە لە کۆمەڵدا جێبەجێیان دەکات، ئەم کارانەش هێندە زۆر و ئاڵۆز و وردن، هەروا بە ئاسانی جیاناکرێنەوە، و هەر چەندێکیش هەوڵبدرێت، ئەوە کەلێن دەکەوێتە دابەشکردنەکانیانەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا زۆر لە زمانناسان حەوت ئەرك دەست نیشاندەکەن :[1]

### ١ـ زانیاری و هەواڵگەیاندن:

بە ئەرکێکی سەرەکی زمان دادەنرێت، کە بەهۆیەوە قسەکەر زانیاری دەربارەی دەوروبەری خۆی بڵاودەکاتەوە.

هەواڵگەیاندنیش پەیوەندی بە لایەنی زانین و هۆشەوە هەی و قسەکەر سەرچاوەی زانینە، چونکە قسەکەر زانیاری بە گوێگر دەگەیەنێت. لەم جۆرەدا قسەکەر دەیەوێ بوون و نەبوونی یان ڕاستی و ناڕاستی دیاردەکان پیشان بدات. لەهەمان کاتیشدا ڕستەکانی هەواڵگەیاندن مەرج نییە هەر ڕاست بێت، بەڵکو دەشێ هەڵەبێت، چونکە لێرەدا ئەرکی قسەکەر تەنیا گەیاندنی زانیارییە. نیشانەی ڕستەی هەواڵگەیاندنیش (. )، کە لە کۆتایی ڕستەکە دادەنرێت. وەکو:

**ـ هەنگوین شیرینە.**

---

[1]ـ بۆ زیاتر زانیاری سەیری ئەم سەرچاوانە بکە: ـ محمد معروف فتاح(١٩٩٠)، زمانەوانی، چاپخانەی (دار الحكمة)، بەغدا.ب ـ ئەورەحمانی حاجی مارف (٢٠٠٤)، فەرهەنگی زاراوەی زمانناسی، سلێمانی.

**- ڕاستی خۆشە.**

**٢- پرسیارکردن:**

مەبەست لە پرسیارکردن دەست خستنی زانیارییە، بە واتای ئەوەی بەهۆی پرسیارکردنەوە قسەکەر دەتوانێ کەلێنێ یان چەند کەلێنێك لە زانیاری خۆی بەرانبەر دیاردەیەك یان دیاردەکان پڕ بکاتەوە، لێرەدا قسەکەر زانیاری تەواوی لە بارەی شتێکەوە نییە، بەڵکو لە ڕێگەی پرسیارەوە دەگاتە زانیارییەکان،واتە لە پرسیرکردندا گوێکر سەرچاوەی زانینە، لەمەدا پرسیارکردن پێچەوانەی هەواڵگەیاندنە، چونکە لە ڕستەی هەواڵگەیاندندا قسەکەر زانیاری دەگەیەنێ و بڵاودەکاتەوە و سەرچاوەی زانیارییە، کەچی لە پرسیارکردندا گوێگر سەرچاوەی زانینە.

لە پرسیارکردندا نیشانەی پرسیار (؟) لە کۆتایی ڕستەدا دادەنرێت و زۆر جاران جێناوی پرسیاریش لە ڕستەکەدا دەبینرێن، وەکو :

**- کەی دەچین بۆ زانکۆ؟**

**- ئایا ئەمڕۆ دەوام هەیە؟**

**٣- هەست دەربڕین:**

بەو ڕستانە دەوترێت کە قسەکەر هەست و ئارەزووی خۆی بەرانبەر دەوروبەری دەردەبڕێت، ئەم هەست دەربڕینەش یان بۆ حاڵەتی خۆشییە یان بۆ حاڵەتی ناخۆشی.

سادەترین جۆری هەست دەربڕینیش لەو گوتنانەدا دەردەکەوێ کە سەرسوڕمانی تێدایە، و لە ڕستەی سەرسوڕمانیدا نیشانەی سەرسوڕمانی ( ! ) لە ڕستەدا دەبینرێت.

ڕستەی سەرسوڕمانی بە دوو شێواز بەکاردێت:

شێوازی یەکەم : بۆ حاڵەتی خۆشییە ، کە لەم جۆرەدا قسەکەر هەستی خۆشی خۆی بەرانبەر دەوروبەری دەردەبڕێت، بۆیە لەمجۆرەدا وشەکانی ( هەربژی، ئافەرین،ئۆخەی،...... ) بەکاردێت، وەك:

**ئۆخەی! لەم بابەتە ڕزگارمان بوو.**

**ئافەرین! بەیەکەم دەرچــــووی.**

شێوازی دووەم: ڕستەی سەرسوڕمانی کە بۆ حاڵەتی ناخۆشی بەکاردێت، لەم جۆرەدا قسەکەر هەستی ناخۆشی خۆی بەرانبەر بە دەوروبەر دەردەبڕێت. لەم حاڵەتەشدا وشە سەرسوڕمانەکانی (ئاخ، ئۆف، پەکو، ئای،.....) بەکاردێ، وەك:

**ئاخ! لەم منداڵــە.**

**ئۆف! لە کچی ئەم زەمانە.**

**٤ـ هەست وروژاندن:**

مەبەست لە هەست وروژاندن ئەوەیە کە کەسێك یاخود قسەکەر هەستی کەسێك یان چەند کەسێك بوروژێنێت و هەست و ئارەزوویەکی تایبەتی لەلایان دروست بکات، یا دڵیان خۆشبکات یا ڕایانپەڕێنێت.

ئەم بەکارهێنانەی زمان لە نوکتە گێڕانەوە و پڕوپاگەندە و تراژیدیا زۆرتر دەردەکەوێ، هەروەها لە وتاری بەرپرسێکی سیاسی کاتێك سیاسەتمەدارێك لە وتارێکی سیاسیدا هانی خەڵك دەدات و هەستیان بۆ مەسەلەیەکی نەتەوەیی دەورووژێنێت یان پیاوانی ئایینی لە وتارێکی ئایینیدا هەستی خەڵك دەورووژێنن و هانیان دەدەن بۆ ئەوەی لە کاری خراپە دوورکەونەوە و لە کاری چاکەکاری نزیکببنەوە یان دوو دڵدار کاتێ لە پرۆسەی خۆشەویستیدان، یەکێکیان هەستی ئەویتریان دەورووژێنیت، وەك:

**ـ ئەوەی نوێژ نەکات ناچێتە بەهەشت.**

کەواتە هەست دەربڕین و هەست ورووژاندن پێچەوانەی یەکترن، چونکە لـە هەسـت دەربڕیندا قسەکەر هەستی خۆی دەردەبڕێت، بەڵام لـە هەسـت ورووژاندنـدا قسـەکەر دەبێتە هۆکارێك بۆ وروژاندنی هەستی گوێگر، بـەو واتایـەی لـە هەسـت ورووژاندنـدا قسەکەر بە دوای خاڵێکدا دەگەڕێت، بۆ ئەوەی
هەستی گوێگر بوروژێنێت.

**٥ـ فەرماندان:**

مەبەست لە فەرماندان ئەوەیە، کە کەسی یەکەم واتە قسەکەر، داوا لە کەسی دووەم واتە گـوێگر دەکـات کارێـك ئەنجامبـدات یـان ئەنجامنـەدات، بـەو واتایـەی قسـەکەر داوایەك ئاراستەی گوێگر دەکات، لـە بەرانبـەردا گـوێگر داوایەکـەی جێبەجێـدەکات. وەکو:

**ـ نانەکە بخۆ.**

**ـ پەنجەرە دامەخە.**

واتە لێرەدا قسەر بڕیاردەری کارەکەیە و دەیەوێ کارێك بە گـوێگر جێبـەجێی بکـات، بۆیە لێرەدا گوێگر بە دوای ڕاستی و دروسـتی ڕسـتەکە یـان قسـەکە ناگەڕێـت، بـەڵکو تەنیا لەسەریەتی کارەکە جێبەجێ بکات.

**٦ـ ڕاپەڕاندن:**

مەبەست لە ڕاپەڕاندن ئەوەیە کە قسەکەر خۆی بە ئەنجامدانی کارەکـە هەڵدەسـتێ، واتە لێرەدا ڕاپەڕاندن پێچەوانەی فەرماندانە، چونکە لە فەرماندانـدا قسـەکەر داوای لە گوێگر دەکات کارێك بکات، کەچی لێرەدا قسەکەر خۆی بە کارەکە هەڵدەسـتێ و ئەنجامی دەدات، وەکو:

**ـ سوێند دەخۆم کە ڕاستی بڵێم.**

**ـ بەڵێن دەدەم ئەم کارە بکەم.**

**٧ـ جێخۆشکردن:**

ئەم ئەرکە لەو ئەرکانەیە کە زۆر بڵاوە و لە هەموو ئەرکەکانی تر سادە و ساکارترە، کە ئەرکی کۆمەڵایەتیشی پێ دەوترێ. ئەم ئەرکە زیاتر لەوگوتنانەدا دەردەکەوێ کە ڕۆژانە بەسەر زاری هەموو کەسێکەوەیە بۆ مەبەستی ئاگاداربوون لە بار و سەربردەی یەکتر و یەکدی دواندن و ڕێزگرتن........، کە ئەمەش بۆ مەبەستی خۆ بردنەپێشەوە و شوێن خۆشکردن و خۆچەسپاندن لەناو کۆمەڵگەی مرۆڤایەتیدا بەکاردێت، وەك سڵاوکردن و خواحافیزی و چاك و چۆنی و پرسینەوە لە خۆشی و ناخۆشی........ وەك:

**چۆنی؟**

**چاکی؟**

**باشی؟**

**شەوباش؟**

**سوپاس.**

**شەوێکی شاد.**

**خوات لەگەڵ.**

دەبێ ئەوەش ڕوونبکەینەوە کە کاتێك دوو کەس سڵاو لە یەکتر دەکەن و وشەی (چۆنی) و (چاکی) بەکاردەهێنن، ئەوە ئەمجۆرە پەیوەندییە دەچێتە نێو پەیوەندی کۆمەڵایەتی، چونکە ئەم سڵاوکردنە ئەوە دەگەیەنێت، کە یەکتری دەناسن یان دۆست و هاوڕێی یەکترن، بەو واتایەی ئەم سڵاوکردنەی قسەکەر لە گوێگر، ئەوە ناگەیەنێت کە گوێگر باسی لایەنی تەندروستی خۆی بۆ بکات یان ڕاپۆرتی پزیشکی بۆ بخوێنێتەوە، بەڵکو تەنیا پەیوەندی نزیکیی نێوان قسەکەر و گوێگر دەگەیەنێت.

## ٣ـ١ : گریمانەکانی پەیدابوونی زمان

لەو کاتەی کە زمان پەیدابووە و تا بە ئەمڕۆ دەگات، گومانی تێدا نییە کە بە چەندین قۆناغی جیاجیادا تێپەڕیوە، لەم بارەشەوە زمانەوانان و شارەزایان خۆیان بە گێروگرفت و سەرەتاکانی پەیدابوونی زمان تەرخانکردووە. بەهۆیەوە کۆمەڵێ گریمانە هاتۆتە کایەوە و هەریەکە هەوڵدەدات سەرەتای پەیدابوونی زمان بۆ گریمانەکەی خۆی کێش بکات. لێرەدا بە کورتی هەندێ لە گریمانەکانی پەیدابوونی زمان دەخەینە ڕوو:

### ١ـ گریمانەی یەکەم: زمان کردەیەکی خواییە

ئەم گریمانە پێی وایە، کە زمانی ئادەمیزاد بەخشینێکی خواییە، واتە زمان لەلایەن خواوە هاتۆتە خوارەوە و خەڵکی فێری ئاخاوتن و ناوی شتەکان کردووە، هەر بۆیەشە زۆر لە شارەزایان و زمانەوانان لەسەر ئەو باوەڕەن کە زمان لەلایەن خواوە بە مرۆڤ بەخشراوە، هەروەکو فەیلەسوفی یۆنانی (هێراکلیت)و لێکۆڵەری زمانی عەرەبی(ئیبن فارس) لە کتێبی (ئەلخەسایس) و(لامی) لە کتێبی(هونەری قسە) و دۆبونالد لە کتێبی (تەشریعی کۆن) لێکۆڵەری زمانی عەرەبی(ئیبن فارس) لە کتێبی (ئەلخەسایس)، و(لامی) لە کتێبی(هونەری ئاخاوتن) و دۆبونالد لە کتێبی (تەشریعی کۆن) ئاماژەیان بۆ کردووە[1]. هەمدیسان کتێبە ئایینییە پیرۆزەکانی (تەورات، ئینجیل، قورئان) ئەم ڕاستییە دووپات دەکەنەوە لە بەخشینی زمان وەکو کردەیەکی خوایی.

موسڵمانەکان بەگشتی بۆ سەلماندنی قسەکانیان پەنا بۆ قورئانی پیرۆز دەبەن، هەروەکو خوای گەورە دەفەرموویێت((وعلم ءادم الاسماء كلها....)) ـ سورەتی

---

[1] - علی عبدلواحد وافی (د)، علم اللغة، دار نهضة، مصر، ١٩٩٠،ص ٩٧ـ ٩٨.

بەقەرە، ئایەتی ٣١، واتە (خودا هەموو ناوێکی فێری ئادەم کردووە) ـ قورئانی پیرۆز، وەگێڕدراوی مامۆستا هەژار ـ.

لێرەدا هەندێ لە شارەزایان ئەم ئایەتە بە جۆرێکی تر لێکدەدەنەوە و دەڵێن: خوای گەورە ئادەمی فێری زمانەکان کردووە.

هەروەها ئیبن جونەیی لە کتێبی(ئەلخەسایس) ئاماژە بە ڕاستی ئەم گریمانە کردووە، هەروەها هەندێکی تر پشتیان بە شتی تر بەستووە و دەڵێن: خوای گەورە کاتێ گشت ئاژەڵەکانی کێڵگە و باڵندەکانی ئاسمانی لە قوڕ دروست کرد، لەدواییدا خستییە بەردەم ئادەمەوە، داخۆ چۆن ناویان دەبات، هەر بۆیە ئادەم ناوی بۆ هەموو ئاژەڵەکان و باڵندەکان و ئادەمیزادەکان داناوە. واتە (ئادەم) یەکەمین کەسە کە فێری زمان بووە، لەبارەی ئەو زمانەی (ئادەم) فێری بووە، دوو بۆچوون هەیە، یەکەکیان دەڵێت فێری زمانی (عیبری) بووە، کە زمانی جوولەکەیە، بەڵام هەندێکی دیکە دەڵێن زمانی عەرەبییە، چونکە زمانی دوایی زمانی عەرەبییە، ئەوانەی ئەم بۆچوونەیان هەیە، ئەمانەن: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس و ئەنەسی کوڕی مالیك لە هاوەڵانی پێغەمبەر(د. خ) و لە ناو شارەزایان و شوێنکەوتووانی (ئەبو شەهابی زوهەری) و (ئیبن مەنزور و ئیبن فارس) دان بە ڕاستی ئەم گریمانە و بۆچوونە دادەنێن.[1]

شارەزایانی عەرەبیش بە هێنانەوەی فەرموودەیەکی لاواز، گوایە فەرموودەی پێغەمبەرە(د.خ)، دەڵێن زمانی عەرەبی زمانی خەڵکی بەهەشتە، فەرموودەکەش بەمشێوەیە: ((احب العرب لثلاث : لأني عربي و القرأن عربي و كلام اهل الجنة عربي)).واتە: من( مەبەستی پێغەمبەرە) لەبەر سێ شت عەرەبم خۆشدەوێت: چونکە من عەربم و قورئان عەرەبییە و قسەی خەڵکی بەهەشتیش عەرەبییە)). دیارە ئەم فەرموودەیە لەو ڕیوایەتانەیە، کە هیچ بنەمایەکیان نییە، هەروەکو پێشەوای

---

1 - هەمان سەرچاوە ، ل ٩٨ ـ ١٠٠.

فەرموودەناسەکان جەختیان لەسەر کردۆتەوە و بە زمانی پێغەمبەر ( د.خ) هەڵبەستراون.[1]

کەچی هەندێکی تر پێیان وایە زمانی عیبری ، زمانی یەکەمی مرۆڤ بووە، واتە زمانی جولەکەکانە، لەبەرئەوەی یەکەمین پێغەمبەر حەزرەتی ئادەم بووە و بۆ ئەوان هاتووە.

## ٢ـ گریمانەی دووەم: ڕێککەوتن

ئەم گریمانە باوەڕی وایە کە زمان کردەی مرۆڤە، بەو واتایەی مرۆڤ دایهێناوە، بەمەشەوە تاکەکانی نێو کۆمەڵ لەسەر وشە و زاراوەکان ڕێککەوتن کە بۆ چ مەبەست و حاڵەتێك بەکاری بهێنن، واتە لەسەر ئەوە ڕێککەوتن کە بە(بەرد) بڵێن(بەرد) و بە(دار) بڵێن (دار)و....... هتد. لە هەمانکاتیشدا هەر زمانێك شێوازی ڕێککەوتنەکەی لە دیاریکردنی وشە و زارەوەکە لەگەڵ زمانێکی تر جیایە.

ئەوانەی ئەم گریمانەیان داناوە و باوەڕیان پێی هەیە، بریتین لە فەیلەسوفی یۆنانی (دیموکرات) و فەیلەسوفەکانی ئینگلیزی(ئادەم سیمت) و (رید) و (دوگالد ستیورات).

## ٣ـ گریمانەی سێیەم: غەریزەی تایبەتی

ئەم گریمانە پەیدابوونی زمان دەگەڕێنێتەوە بۆ سەر غەریزەی تایبەتی، کە لە بنچینەدا هەموو ئادەمیزادێك هەیەتی، بۆ نموونە لە کاتی سروشتی هەڵچوونی ئادەمیزاددا وەك(تێکچوونی دەموچاو، وەستانی پرچی سەر، پێکەنین، گریان،.......... تد)، کە وا لە تاکەکەس دەکات بە هەندێ جولانەوە هەڵسێ و هەندێ دەنگی تایبەتی دەربڕێ، ئەمەش لە هەر حاڵەتێك کە هەڵچوون ڕوویدات،

---

[1]- عومەر مەلا محەمەد ئەمین، کوردستان لەبەردەم پیلاندا، ل ٢٤ ـ ٢٥.

وەك: (تورەیی، ترس، دڵتەنگی،......)، ئەم دەربڕینانەش لە هەموو کەسێکدا هەیە، هەر لەبەر ئەمەشە وشە و ڕێگەی دەربڕینی وشە لای ئادەمیزاد یەکەمجار وەکو یەك بووە، هەر ئەمەش وایکردووە خەڵك لە یەکتری بگەن. ئەوانەی لەسەر ئەم گریمانە دەڕۆن و باوەڕیان پێی هەیە، بریتین لە (ماکس مۆلەری زانای ئەڵمانی) و (ڕێنان)ی زانای فەرەنسی.

## ٤ـ گریمانەی چوارەم: سروشت و دەنگە سروشتییەکان

هەندێ لە شارەزایان پێیان وایە کە زمانی ئادەمیزاد لە دەنگەکانی سروشت پەیدابووە،[1] واتە(دەنگەکانی ئاژەڵ، ئەو دەنگانەی بەهۆی لێدان و بڕین و شکانەوە پەیدادەبن، وەکو دەنگی هاژەی ڕووبار و بروسك و هەور..... هتد). هەریەك لەمانە کاریگەرییەکی زۆری هەبووە لەسەر مرۆڤ، بەهۆیەوە توانیوەییەتی فێری زمان بێت. ئەوانەی لەسەر ئەو باوەڕەن کە زمانی مرۆڤ لە دەنگەکانی سروشتەوە پەیدابووبێ، لەوانە (ئەفلاتۆن) و (وتنی) و (ئبین جونەی) و (داروین) ئەمایان دووپات کردۆتەوە. (داروین) لە کتێبی (نەژادی بنەچەکان) دەڵێت: "زمانی مرۆڤ و هاواری گیانەوەر تەنیا لە پلە جیاوازن. زمانی مرۆڤ وەك مرۆڤ خۆی بەشێوەیەکی زۆر بەراییەوە هاتووە، بەرە بەرە پەرەی سەندووەو پێویستییەکانی وای لێکردووە قسە بکات".

دیارە ئەم گریمانەیە کەموکووڕی زۆرە، لەوانە ئەگەر مرۆڤ لە سەرەتاوە بە هاژەی ڕووبار یان هەر جۆرە دەنگێکی تر فێری زمان بووبێت، ئەی چۆن گیاندارەکان فێری هەمان زمانی مرۆڤ نەبوونە، هەروەها وەکو دەزانین دەنگی سروشتی لەهەر کوێی جیهان بێت، هەمووی یەك جۆرە دەنگە، ئەی بۆ مرۆڤەکان فێری زمانی جیاواز بوونە؟ بۆچی هەموویان بە یەك جۆرە زمان و یەك شێواز قسە ناکەن.

---

[1] ـ سەلام ناوخۆش و نەریمان خۆشناو و ئیدریس عەبدوڵڵا، کوردۆلۆجی، چاپخانەی ڕۆژهەلات، هەولێر، ٢٠١١، ل٤٨.

**٥- گریمانەی پێنجەم: کۆمەڵایەتی**

لایەنگیرانی ئەم گریمانە باوەڕیان وایە کە زمان دیاردەیەکی کۆمەڵایەتییە، واتە زمان تایبەتە بە کۆمەڵ و کۆمەڵگە،[1] لە هەمان کاتیشدا ئەوەش ڕوون دەکەنەوە کە هیچ مرۆڤ و کۆمەڵ و کۆمەڵگەیێك نییە بێ زمان بێ، واتە تا مرۆڤ تێکەڵ بە کۆمەڵ نەبێ، ئەوا ناتوانێ فێری زمان بێت، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە زمانی مرۆڤ شتێکی وەرگرە و ناچێتە حاڵەتی بۆماوەیی. لەم بارەشەوە زمانەوانان بۆ سەلماندنی قسەکانیان چەندین تاقیکردنەوەی واقعییان ئەنجامداوە و بۆیان دەرکەوتووە کە ئەگەر مرۆڤ تێکەڵ بە کۆمەڵگە نەبێ، ئەوا ناتوانێ بە هیچ شێوەیەك قسە بکات و فێری زمان ببێت.

**٦- گریمانەی شەشەم: بانگوقیژە**

ئەم گریمانەیە پشت بەوە دەبەستێت، کە زمان پەیوەستە بە مرۆڤ و لەسەر بنەمای بانگوقیژەوە پەیدابووە.[2]

ئەوانەی باوەڕیان بەم گریمانە هەیە، لەوانە زانای ئەڵمانی (شتاینتال)، لایەنگرانی ئەم گریمانەیە لەو باوەڕەدان کە زمان لەو دەنگانەوە پەیدابووە، کە مرۆڤ بۆ خۆشی و ناخۆشی و ئازار و پەستی بەکاریهێناوە.

**٧- گریمانەی حەوتەم: بزاوتن**

ئەم گریمانەیە لەسەر بنەمای جووڵەوە هاتۆتە ئاراوە، ئەویش جووڵەکانی وەك (سەرلەقاندن،چاوتروکاندن، لێوقوچاندن....) هاتۆتەکایەوە.[3]

---

1 - نەریمان خۆشناو، ئەرك و گریمانەکانی زمان، ل ١٦.

٢ ـ محمد معروف فتاح، زمانەوانی، چاپخانەی (دار الحکمة)، ١٩٩٠، ل ١٠.

3- هەمان سەرچاوە، ل ١٠ـ ١١.

ئەوانەی باوەڕیان بەم گریمانە هەیە، لەوانە زانای ئەڵمانی(ڤۆنت) و زانای ڕووسی (مار)، لایەنگرانی ئەم گریمانەیە لەو باوەڕەدان کە لەیەکترگەیشتن لەناو مرۆڤ لە بنەڕەتدا لەم جۆرە بزاوتنەوە بووە کە لە دواییدا گۆڕاوە بە زمانی ئاسایی.

**٨ـ گریمانەی هەشتەم: مۆسیقا**

ئەم گریمانەیە وای دادەنێت کە زمان لە گۆرانییەوە هاتووە، یاخود هەردووکیان (زمان و مۆسیقا) سەر بە یەك بنچینەن.[1]

ئەوانەی باوەڕیان بەم گریمانە هەیە، لەوانە (یسپرسن) و کۆمەڵێ لە ڕۆناکبیران، لایەنگرانی ئەم گریمانەیە لەو باوەڕەدان کە زمان لە گەشەکردنیدا بە چەند قۆناغێکدا تێپەڕیوە، بە جۆرێك لە قۆناغێکدا زمان بریتی بووە لە وشەی درێژ، هەر بۆیە لەم قۆناغەدا زمانی مرۆڤ ئاوازدارتر بووە بە بەراورد لەگەڵ زمانی ئەمڕۆکە.

---

[1] - محمد معروف فتاح، زمانەوانی، ل ١٢.

## ٤ـ١: تایبەتمەندییەکانی زمان

### ١ـ زمان دەنگ و واتایە

زمان لە دوو ئاستدا کاردەکات،ئەم دوو ئاستەش بریتین لە دەنگ و واتا، ئاستی دەنگ کە دروستکردنی دەنگەکان دەگرێتەوە، و ئاستی واتاش کە لێکدانی دەنگەکان دەگرێتەوە، بەهۆیەوە دەنگەکان دەکات بە مۆرفیم و مۆرفیمەکان دەکات بە وشە و وشەکان دەکات بە گرێ و گرێیەکان دەکات بە ڕستە و ڕستەکان دەکات بە ئاخاوتن. بەهۆی ئەم دوو ئاستەش مرۆڤ دەتوانێت بەهۆی چەند دەنگێکەوە ژمارەیەکی یەکجار زۆر مۆرفیم و وشە و گرێ و ڕستە دروست بکات.بەو واتایەی مرۆڤ بە هۆی ئەم دەنگانەوە هەمیشە وشە و گرێ و ڕستەی نوێ دروست بکات.

مرۆڤ کاتێ قسەدەکات، سوود لەو هەوایە وەردەگرێت کە لە سییەکانەوە دێتە دەرەوە و دەگاتە بە قورگ و دەنگە ژێیەکان و دەنگ دروست دەکات.

### ٢ـ زمان پێڕەو و یاسایە:

لە زماندا ئەگەر پێڕەو و یاسا و دەستوور نەبێت، ئەوە کردەی تێگەیشتن زۆر زەحمەت دەبوو، هەر بۆیە لە هەموو ئاستەکانی زماندا دەستوور و یاسا هەیە، واتە زمان بریتی نییە لە کۆمەڵە دەنگێك یان وشەیەك کە لەخۆوە ڕیزکرابن، بەڵکو بەپێچەوانەوە خاوەنی یاسا و ڕێسایە، بۆنموونە یاساکانی دەنگ لە هەموو زمانێکدا سیستەمێکی ڕێکوپێکی هەیە بۆ لێکدانی بزوێن و نەبزوێنەکان، چونکە ئەگەر ئەو یاسایە نەبێت، ئەوە زمانەکە شێوەی دروستکردنی وشە و مۆرفیمی تێکدەچێت.

ئەم پێڕەوەی باسی لێوە دەکەین، ئەوە لەگەڵ لەدایکبوونی مرۆڤ لەدایکدەبێت

**٣ـ زمان لە خۆوەیە:**

پەیوەندییەکی دیار و ئاشکرا لە نێوان هێما زمانییەکان و واتاکانیاندا نییە، واتە ئەو تایبەتمەندییەی زمان ئەوە دەردەخات، کە هیچ پەیوەندییەکی سروشتی نییە لەنێوان وشە و ئەو شتەی کە هێمای بۆ دەکات، هەرچەندە لە وشە سروشتییەکاندا هەندێ لێکچوون بەدی دەکرێت، بەڵام ئەم وشانە گرنگییان لە زماندا پێنادرێت، چونکە لە کۆمەڵێکەوە بۆ کۆمەڵێکی دی دەگۆڕێن و ژمارەشیان لەچاو ژمارەی تری وشەی زمانەکەدا کەمن. واتە پەیوەندی نێوان هێما و هێمابۆکراو پەیوەندییەکی لەخۆوەیە، بۆنموونە وشەی (مار) لە نووسین و گۆکردندا هیچ پەیوەندییەکی بە شێوەی مارەوە نییە.

**٤ـ زمان تایبەتە بە مرۆڤ:**

لە تێڕوانین و بۆچوونەکانی زمانناسان ئەوە ڕوونکراوەتەوە، کە زمان پەیوەستە بە مرۆڤ، واتە پەیڕەوی گەیاندن لە گیانلەبەران و زیندەوەری تردا تایبەتییەکانی زمانی مرۆڤی تێدا نییە و بە زمان دانانرێن، تەنانەت زمانی (تووتی)یش ناکرێت وەکو زمانێکی زیندوو و گەشەسەندوو سەیر بکرێت، چونکە ئەم زمانە جۆرێکە لە لاسایکردنەوەی مرۆڤ.

بۆیە لێرەدا گەرەکە هەندێ لایەنی جیاوازی نێوان زمانی مرۆڤ و زمانی گیانلەبەران بخەینەڕوو:

اـ زمانی مرۆڤ دیاردەیەکی کۆمەڵایەتییە، چونکە مرۆڤ لەنێو کۆمەڵ و کۆمەڵگەدا فێری زمان دەبێت، بەو واتایەی مرۆڤ لە ڕێگەی فێربوونەوە فێری زمان دەبێت، کەچی زمانی گیانلەبەران بۆماوەییە، بەو واتایەی پێویستی بە کردەی فێربوون نییە.

ب ـ زمانی مرۆڤ هەمیشە لە گۆڕان و گەشەسەندندایە، کەچی زمانی گیانلەبەران لە پلەیەکی چەسپاو و نەگۆڕدان، بەڵکو تەنیا سنوورێکی دیاریکراو و تەسك دەگرێتەوە.

ج ـ زمانی مرۆڤ توانای ئەوەی هەیە نەك هەر لەو شتانە بدوێت، کە لە ئێستا و شوێنێکی دیاریکراو ڕوودەدەن، بەڵکو دەتوانێت باسی ڕووداوێك بکات کە هەزاران ساڵ پێش ئێستا ڕوویدابێت، یاخود باسی ڕووداوێك بکات کە لە داهاتوودا ڕوودەدات، سەرباری ئەوەش زمانی مرۆڤ درك بە شتە شاراو و غەیبییەکانیش دەکات، بەوەی مرۆڤ دەتوانێت باسی بەهەشت و دۆزەخ و فریشتە و جنۆکە بکات، هەرچی زمانی گیانلەبەرانە ئەوە زۆر کاتی و سنووردارە، چونکە هەر دەتوانێت گوزارشت لە ئێستا و ئەو شوێنە بکات، بۆنموونە کاتێك پشیلە کە لەبەر پێیەکانت دەمیاوێنێ، مانای ئەوەیە کە ئێستا نەك دوێنێ برسییەتی یان تێنوویەتی، یاخود بەهەمان شێوە سەگیش کە دەحەپێت، مانای ئەوەیە کە برسییەتی یان تێنوویەتی یان ترسێك لە ئارادایە.

د ـ مرۆڤ هەمیشە دەتوانێت بۆ هەموو ڕەوش و حاڵەت و ڕووداوێك وشەی نوێ دابهێنێت و بەکاری بهێنێت، چونکە داهێنانی وشەی نوێ و ڕستەی نوێ و بیری نوێ یەکێکە لە توانستەکانی مرۆڤ ، بەڵام ئەم توانستە لای گیانلەبەران نییە.

### ٥ـ زمان ڕەمزە:

زمان لە کۆد و ڕەمز و ئامراز پێکدێت بۆ گەیاندنی زانیاری بە مەبەستی هاوکاریکردن، واتە زمان جۆرێکە لە چالاکی کۆمەڵایەتی.

ڕەمزیش مەبەستمان لەو هێمایانەیە کە بۆ دەنگ دانراون، ئەو دەنگانە لەخۆیانەوە هێمان ، ئەم هێمایانەش کە بەرانبەر هەر دەنگێك لە دەنگەکانی زمان دانراون، لە زمانێکەوە بۆ زمانێکی تر دەگۆڕدرێت، لەهەمان کاتیشدا هیچ یەك لەو

دەنگانە واتای خۆیان نییە، بەڵکو کۆمەڵ لەسەری ڕێککەوتوون و کۆمەڵگە واتایان پێدەبەخشێت.

ڕەمزیش چەند جۆرێکی هەیە:

اـ ڕەمزی وێنەیی: لێرەدا پەیوەندی نێوان دەنگ و واتاکە هەیە، وەکو دەست بردن بۆ دەم، واتای ئەوە دەگەیەنێت، کە مەبەستی برسییەتییە.

ب ـ ڕەمزی هۆیی: لێرەدا هۆیەك هەیە کە پەیوەستە بە ڕەمزەکەوە، وەکو زەردهەڵگەڕانی مرۆڤ، هۆکارێکە یاخود ڕەمزی هۆییە و پەیوەستە بە نەخۆشی یان ترس.

ج ـ ڕەمزی لەخۆوە: ئەمجۆرە ڕەمزە هیچ پەیوەندییەك لە نێوان دەنگ و واتاکە نییە، واتە ئەمجۆرەیان زیاتر دەچێتە نێو بواری زمانەوانییەوە، بۆنموونە (بڵێسە یاخود مەشخەڵ) واتای خوێندەواری دەگەیەنێت.

### ٦ـ زمان زیندووە و لە گۆڕاندایە:

زمان هەمیشە لە گۆڕاندایە، بەڕادەیەك کە لە ماوەی چەند ساڵێکدا هیچ لە زمانە بنەڕەتەکە نامێنێتەوە.زمانی مرۆڤ هەمیشە لە گۆڕان و گەشەسەندندایە، هەر لەو کاتەی کە زمان پەیدابووە، تاکو بە ئەمڕۆ دەگات، زمان بە چەندین قۆناغی جیاجیادا ڕۆیشتووە و تێپەڕیوە، ئەم قۆناغانەش گۆڕانێکی بنچینەییان لە زمانی مرۆڤدا دروستکردووە، بەجۆرێك لە سەرەتاد ا لەسەر ڕووی زەمینتەنیا یەك زمان هەبووە، بەڵام دواتر بەگوێرەی ڕۆژگار پەرەی سەندووە و بووتە چەندین زمان، هەر زمانێکیش چەندین زار و بنزاری جیاجیا بەخۆوە دەگرێت.

### ٥ـ١: جۆرەکانی زمان

زمان گەلێ جۆری هەیە، لێرەدا هەندێ لە گرنگترین جۆرەکانی زمان دەخەینەڕوو، کە پەیوەندی بە باسەکەمانەوە هەیە[1]:

**١ـ زمانی سەرچاوە:**

ئەو زمانەیە، کە چەندەها زمانی دی لێکەوتۆتەوە، زمانەکانی پورتوگالی و ئیسپانی و فەرەنسی و ئیتالی لە زمانی لاتینییەوە سەرچاوەی گرتووە ، زمانی سانسکریتیش هەردوو زمانی ئۆردو و هیندی دروست کردووە.

**٢ـ لقە زمان:**

ئەو زمانەیە، کە لە زمانی سەرچاوەوە پەیدابووە، بۆ نموونە زمانی فەڕەنسی کە لقە زمانی لاتینییە، زمانی ئەڵمانی لە ئەڵمانی ڕۆژئاواییەوە دەرکەوتووە، زمانی سویدیش لقە زمانی جەرمانی باکوور و، زمانی ڕووسیش لقە زمانی سلاڤی ڕۆژهەڵاتییە.

**٣ـ زمانی خوشك:**

ئەو زمانەیە، کە لە ڕەچەڵەکدا لەگەڵ زمانێکی دی یەکدەگرێتەوە، بۆ نموونە زمانی دانیمارکی لەگەڵ زمانی نەرویجیدا خوشکی یەکدین، چونکە هەردووکیان سەر بە ئەڵمانی باکوورن. زمانی ئیتالیش خوشکی زمانی فەڕەنسییە، چونکە هەردووکیان لە لاتینیەوە پەیدابوون، هەروەها زمانی پۆڵەندی خوشکی بوهیمییە، چونکە هەردووکیان دەچنەوە سەر سلاڤی ڕۆژئاوا.

---

[1] - زۆربەی جۆرەکانی زمان لەم سەرچاوە وەرگیراوە: محمد علی الخولي (١٩٩٨)، دراسات لغوية، دار الفلاح للنشر والتوزيع، ص ٢٥ ـ ٣٤.

**٤ـ زمانی سروشتی:**

ئەو زمانەیە، کە بەبێ دەستێوەردانی مەرامداری مرۆڤ دروست بووە، واتە لەخۆڕا دروستبووە، ئەم وەسفەش لەسەر سەرجەم زمانەکانی جیهان پراکتیزە دەبێت، چ ئەو زمانانەی کە لەپێشوودا سەریان هەڵداوە و چ ئەو زمانانەی کە ئێستا بڵاوبوونەتەوە.

**٥ـ زمانی دەستکرد:**

ئەو زمانە ناسروشتیەیە بە مەبەستی ئاسانکردنی فێرکردنی زمانێك لەڕێگەی هەڵبژاردنی چەند وشە و چەند پێکهاتەیەکی گرنگەوە دروست دەبێت، لەوانەشە دروستکردنی ئەو زمانە لەڕێگەی هەڵبژاردنی وشەکانی چەند زمانێك بەمەبەستی داهێنانی زمانێکی دی بەرهەمبهێنرێت، ئەویش بە مەبەستی دروستکردنی زمانێك، کە ببێتە زمانێکی جیهانی ئاسان، وەکو زمانی (ئیسپرانتۆ).

**٦ـ زمانی دەنگی:**

ئەو زمانەیە، کە ماناکان لە ڕێگەی دەنگەکانی ئاخافتنەوە پەیدا دەبن، پاشان وشە و ڕستەکان دروست دەبن و بەشێوەی شەپۆلی دەنگی بۆ بیسەرەکان دەگوازرێنەوە و گوێگر گوێی لێ دەبێت و لێی تێدەگات، وەك ئەو زمانەی کە لە کاسێت و ڕادیۆ و تەلەفۆنەوە بەر گوێ دەکەوێت.

**٧ـ زمانی نووسراو:**

ئەو زمانەیە، کە ماناکان لەڕێگەی ئەو پیتانەوە دەگوازێتەوە، کە وشە و ڕستە دروست دەکات، کە دەیاننووسین، پاشان لەسەر شێوەی شەپۆلی ڕووناکی بۆ چاوەکان حەواڵە دەبن، ئیتر خوێنەر دەیبینێت و لێی تێدەگات، وەکو ئەو زمانەی کە لە پەرتووکەکان و ڕۆژنامەکاندا دەیانخوێنینەوە.

**٨ـ زمانی هێما:**

هەندێك زمان هەن کە نە گوێمان لێدەبێت و نەوەکو پیتیش لەسەر کاغەز دەیانبینین، چونکە وەکو هێما بەهۆی پەنجە یان هەر ئامرازێکی ترەوە بێت ئەنجام دەدرێت، وەکو ئەو هێمایانەی کە کەڕولاڵەکان ئەنجامی دەدەن، هەروەها هێماکانی ڕێگاوبان، کە هیچ درکاوێکیان نییە، تەنها هەر ئاماژەن، بەلام لەگەڵ ئەوەشدا مانایەکی تایبەت دەبەخشن، کە شوفێر و ڕێبوارەکان لێی تێدەگەن.

**٩ـ زمانی جەستەیی:**

ئەو زمانەیە کە لەگەڵ زمانە دەنگییەکەدایە، کاتێك قسە دەکەین، چاو و پەنجە و دەست و سەر و گەردنمان دەجوولێنەوە، بێگومان هەموو پێکەوە ناجولێنەوە، بەلام جارناجارێك دەستێك یان چاوێك یان پەنجەیەك یان سەرێك یان باسکێك دەجولێتەوە و هەر جوولەیەك مانایەك دەبەخشێ یان قسەیەك هەڵدەوشێنێتەوە یان ڕەتی دەکاتەوە یان جەختی لەسەر دەکاتەوە.

**١٠ـ زمانی منداڵان:**

زمانێکە ژمارەی وشەکانی و فرێزەکانی کەمن و ڕستەکانی زۆر کورتن، هەروەها زمانێکە فۆنەتیکی تایبەتی لە ئاخاوتنندا هەیە. زۆرجار منداڵ دەنگەکان هەڵاوەگێڕ دەکات و، پیتی (س) بە (ش) و (ڕ) بە (ل) دەدرکێنێت، هەروەها زمانی منداڵ پێوانەی بەسەر زاڵە وەك لە زۆر حاڵەتدا دەردەکەوێت.

**١١ـ زمانی هەرزەکاران:**

ئەو زمانەیە، کە گەورەکان قسەی پێدەکەن و لەگەڵ زمانی منداڵان جیاوازی هەیە، چونکە زمانی هەرزەکاران وشەکانی چڕتر و ڕستەکانی درێژتر و پێکهاتەکانی فراوانترن و لە درکاندنیشدا ڕاستترن.

**١٢- زمانی شێوەزار:**

زمانی شێوەزار ئەو زمانەیە، کە شێوەزارێکی تایبەتی پێدەناسرێت، لە ڕێگەی قسەپێکەرانییەوە پێدەناسرێت، جاری واش هەیە زمانەوانێك دەتوانێت لە شێوەزاری کەسێکەوە ناونیشانی ولاتەکەی و بگرە شەقام و باڵەخانەکەی، کە تیاشیدا دەژی بدۆزێتەوە، مەبەست لەم قسەیە ئەوەیە زمانی کەسێك دەلالەت دەکاتە سەر شێوەزارە جوگرافییەکەی و ئاستە ڕۆشنبیرییەکەی.

**١٣- زمانی ستاندار:**

زمانی ناشێوەزار ئەو زمانەیە، مرۆڤ بە شێوەیەك قسەی پێدەکات، دەلالەت ناکاتە سەر شێوەزارێکی تایبەت، بە بەکارهێنانی ئەم زمانە شوێنی جوگرافی ئەو کەسە نازانرێت، زۆرجاریش ئەم شێوازە لە بەرکارهێنانی زمانی پەتیدا بەرجەستە دەبێت.

**١٤- زمانی پەتی:**

زمانی ئەدەب و زانستە، کە زیاتر بۆ فێرکردن بەکاردەهێنرێت و، لە وتنەوەی وانەکانی زانکۆ و قوتابخانەکاندا قسەی پێ دەکرێت، زمانێکە ئەم زمانە وشەی سادە و بازاڕیی و نەشیاوی تیادا نییە، جگە لەمانەش ئەم زمانە سیستەمێکی تایبەتی خۆی هەیە لە درکاندن و، ڕەچاوی بنەما ڕێزمانییەکان دەکات و خۆی لە گوزارشتەکانی ڕەمەکی و درکاندنە بازاڕییەکان دەپارێزێت.

**١٥- زمانی ڕەمەکی:**

ئەو زمانە سادەیەیە لە مامەڵە نافەرمییەکاندا بەکاردەهێنرێت، ئەم زمانە لەنێوان دۆست و برادەران و لەنێوان ئەندامانی خێزاندا بەکاردەهێنرێت، جگە لەوەی ئەم زمانە زمانی ڕستەی کورت و وشە کارتێکراوەکانە، هەروەها زمانی پێکهاتە سادە و ساکارەکانە و دەلالەت دەکاتە سەر شێوەزاری جوگرافی قسەکەرەکە و، لەیەك زمانیشدا چەند شێوەزارێکی ڕەمەکی بەکاردەهێنرێت.

**١٦ـ زمانی زیندوو:**

ئەو زمانەیە، کە لە ژیانی ڕۆژانەدا بەکاردەهێنرێت، جا زمانێك بۆ ئەوەی زیندوو بێت، بەس نییە تەنیا لە بۆنە ئایینی و زانستییەکاندا بەکاربهێنرێت، بەڵکو پێویستە لە ژیانی ڕۆژانەشدا خەڵکی بەکاری بهێنن.

**١٧ـ زمانی مردوو:**

ئەو زمانەیە، کە پێشتر بەکاردەهێنرا، بەڵام لەگەڵ نەمانی ئەوانەی کە قسەی پێدەکەن، ئەویش نەماوە و لەناوچووە، یان لەڕووی تیۆرییەوە لەوانەیە ئەو زمانە هەر مابێ، بەبێ ئەوەی لە نووسین و خوێندندا بەکاربهێنرێ، وەکو زمانی ساسانی و زمانی قوتی، زانایانیش ئەم زمانانەیان لەڕێگەی نەخش و نووسینە مێژووییەکان و شوێنەوار و پەرتووکە دێرینەکانەوە زانیوە.

**١٨ـ زمانی نیمچەزیندوو:**

ئەو زمانەیە، کە لە ژیانی ڕۆژانەی خەڵکیدا بەکارناهێنرێت، بەڵکو تەنها لە بۆنە ئایینی و زانستییەکاندا بەکاردەهێنرێت، زمانی نیمچەزیندوو لەگەڵ زمانی زیندوو جیاوازی هەیە، چونکە لە ئاخافتنی ڕۆژانەدا بەکارناهێنرێت، لەگەڵ زمانی لەناوچووشدا لەو ڕووە جیاوازی هەیە، کە ئەم زمانە تاکو ئێستا هەر ماوە، واتە ئاستێکی ناوەندی وەرگرتووە، لەبەر ئەو هۆیە ناوی لێنراوە زمانی نیمچە زیندوو.

**١٩ـ زمانی ناوەکی:**

ئەو زمانەیە، کە بەبێ درکاندن و بەبێ شەپۆلی دەنگی بە کاری دەهێنێت، واتە لەناو دەروونی خۆی و لەکاتی بیرکردنەوەدا مامەڵە بە وشەکانی دەکات، زمانێکە کەس ناتوانێت گوێی لێ بگرێت و بەهیچ پێوەرێکی دەنگی بیپێوێت و، بە زمانی (گوێ لێ نەبوو)ش ناودەبرێت.

**٢٠ـ زمانی یەکەم:**

ئـەو زمانەیـە، کـە منـداڵ لـەدایك و باوکییـەوە وەریـدەگرێت پـێش ئـەوەی بچـێتە قوتابخانە.

**٢١ـ زمانی دووەم:**

ئەو زمانەیە، کـە منـداڵ پـاش فێربـوونی زمـانی یەکـەم فێـری دەبێـت، سەرچـاوەی فێربوونی ئەم زمانەش یا ماڵ یاخود قوتابخانە یاخود کۆمەڵگایە، ئـەم زمانـە منـداڵ فێری دەبێت، پاشان بۆی دەردەکەوێت کە لە دەرەوەش بەکاردەهێنرێت، بۆ نموونە مرۆڤێکی چـینی، زمانەکـەی لەسـەرەتاوە هـەر چـینییە، بـەڵام گـەر کـۆچ بکـات بـۆ ئەمەریکا و فێری زمانی ئینگلیزی ببێت، ئەوە زمانی دووەمـی بـۆ پەیـدا دەبێـت کـە ئینگلیزییەکەیە، چونکە ئەم زمانی دووەمە لە ژیانی ڕۆژانەیدا بەکاردەهێنرێت.

**٢٢ـ زمانی بێگانە:**

ئەو زمانەیە کە مرۆڤ جگە لە زمانەکەی خۆی، ئەویش فێر دەبێت، واتە هـەر زمانێك زمانی دایك نەبێت یان زمانی قسەکەری وڵاتەکە نەبێت.

**٢٣ـ زمانی فێربوون:**

ئەو زمانە لە حاڵەتێکدا ڕوودەدات، کە لە وڵاتێکـدا زمـانی فێربـوون لەگـەڵ زمـانی یەکەمی خەڵکەکە جیاوازبێ. ئەمەش زۆرجار لـەژێر کاریگـەریی داگیرکردنـدا دروسـت دەبێت، هەروەك لە جـەزائیر لەسـەردەمی ئیسـتیعماری فەڕەنسـی ڕوویـدا. ئەوکاتـە زمـانی فێربـوون زمـانی فەرەنسـی بـوو، کەچـی جـەزائیر وڵاتێکـە زمـانی یەکـەمی خەڵکەکەی عەرەبی بوو، لەوانەشە ئەم حاڵەتە لەلای میللەتێك ڕووبدات، کە فرەزمان بێت، ئەوکاتە دەوڵەت پەنا دەباتە بەر یەکخسـتنی زمـانی فێرکـردن، بـۆ ئـەوەی لـە وڵاتدا زمانێك بکاتە زمانی باڵادەست، هەروەك زمانی ڕووسـی لـە یـەکێتی سـۆڤیەتی پێشوو وابوو.

**٢٤ـ زمانی هاوبەش:**

ئەو زمانەیە کە هەموو یان زۆربەی زۆری وڵاتێك دەیزانن، کە فرەگەل و فرەزمان بن، ئەم زمانەش بۆ لەیەکگەیشتنی نێوان گەلانی یەك وڵات بەکاردەهێنرێت، بۆ نموونە لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا چەندەها کەمینە هەن، کە زمانی تایبەتی خۆیان هەیە، بەڵام زمانە هاوبەشەکەیان زمانی ئینگلیزییە، لە یەکێتی سۆڤیەتیشدا چەندەها زمان و چەندەها کەمینە هەن، بەڵام زمانی ڕووسی زمانی هاوبەشیانە، لە وڵاتە عەرەبییەکانیشدا چەندەها زمان و چەندەها کەمینە هەن، بەڵام زمانە هاوبەشەکەیان زمانی عەرەبییە.

**٢٥ـ زمانی فەرمی:**

ئەو زمانەیە کە حکومەت لە نامە ناردن و بەڵگەنامە و تۆمارنامە و مامەڵەی نێو دامودەزگاکانی حکوومەت و بواری خوێندن کاری پێدەکات، ئەم زمانەش لەگەڵ زمانی باوی وڵاتەکە یەکدەگرێتەوە، بەڵام ئەو زمانە زمانی کەمینەیەك بێت کە خاوەن دەسەڵاتە، یان ئەو زمانە زۆر گرنگ بێت یان زمانەکە تەنیا تایبەت بێ بە مامەڵە فەرمییەکان و، پەیوەندی بە زمانی بەکارهێنراوی گەلەوە نەبێت.

**٢٦ـ زمانی بەرهەمهاتوو:**

ئەو زمانەیە کە لە دوو زمان یان زیاتر پێکدێت، هەندێك پێی دەڵێن زمانی (دوو ڕەگ). دەکرێ ئێستا زمانی ئینگلیزی تازە بە زمانێکی بەرهەمهاتوو هەژمار بکەین، چونکە زمانێکە لە ئینگلیزی ناوەند و لە زمانی فەرەنسییەوە بەرهەمهاتووە. هەروەها زمانی (نوردی) بەرهەمهاتووە، ئەویش لەبەر ئەو ڕێژە زۆرەی وشە هیندی و فارسی و عەرەبیانەی کە لەناویدا هەن.

**٢٧ـ زمانی ناوخۆیی:**

ئەو زمانەیە کە تایبەتە بە یەك میللەت، ئەو زمانە لە دەرەوەی وڵات زمانێکی نەناسراوە، وەکو زمانی ئەلبانی و زمانی ڕۆمانی.

**٢٨ـ زمانی جیهانی:**

ئەو زمانەیە کە لە جیهاندا زۆر بەربڵاوە، ئەم زمانە زۆر بەکاردەهێنرێت و لە چەند وڵاتێکدا وەکو زمانی یەکەم یان زمانی دووەم یان زمانی بێگانە بەکاردەهێنرێت، زمانێکە لە بوارە زانستییەکان و هەردوو بواری بازرگانی و سیاسەتدا زۆر بەکاردەهێنرێت. ئەم شتەش لەسەر چەند زمانێك پراکتیزە دەبێت، هەرچەندە لە ئاستەکانیاندا جۆرێك لە جیاوازی هەیە، وەکو زمانی ئینگلیزی و فەڕەنسی و ئەلمانی و ڕووسی و عەرەبی.

**٢٩ـ زمانی جێگرەوە:**

ئەو زمانەیە کە جێگای زمانێکی دی دەگرێت و وردە وردە لە بازنەی بەکارهێنانی ئەو وڵاتە دەریدەکات، ئەم وەسفەش لەسەر زمانی ئینگلیزیدا پراکتیزە دەبێت، چونکە زمانی ئینگلیزی لە ئەمەریکای باکوور جێی زمانی هیندییە سوورەکانی گرتەوە.

**٣٠ـ زمانی ڕامالراو:**

ئەو زمانەیە کە بەرانبەر بە زمانی جێگرەوە هەرەسی هێناوە، کە زمانی ئەو میللەتەیە کە بەرانبەر میللەتێکی دی بەهێز لە ڕووەکانی ژیاریی یا سەربازیی یا ئابووریی یا ڕۆشنبیریی هەرەسی هێناوە، وەك زمانەکانی هیندییە سوورەکانی ئەمەریکا، چونکە ئەم زمانانە ڕامالراوە و زمانی ئینگلیزی جێی گرتەوە.

**٣١- زمانی باڵادەست:**

ئەو زمانەیە کە لە زمانەکانی دی بەر بڵاوترە لە وڵاتێکی فرەزمانیدا، ئەم زمانە لەگەڵ زمانی جێگرەوە جیاوازە لەو ڕووەوە کە زمانی جێگرەوە زمانەکانی دی لادەبات و جێی زمانە لابراوەکە دەگرێتەوە، بەڵام زمانی باڵادەست لە وڵاتدا بەسەر ئەوانی تردا سەردەکەوێت، بەڵام زمانەکانی دی هەر دەمێنن، بۆ نموونە زمانی فارسی لە ئێران لەهەموویان باڵادەستترە، هەرچەندە لە ئێراندا زمانی تریش هەن کە زمانی کەمینەکانن، وەکو زمانەکانی عەرەبی، کوردی، تورکی،... هتد.

**٣٢- زمانی گشتی:**

ئەو زمانەیە هەموو خەڵك لە وڵاتدا بەکاری دەهێنن، تایبەت نییە بە خاوەن پیشەیەکی دیاریکراو یان بوارێك لە بوارەکانی مەعریفە.

**٣٣- زمانی تایبەتی:**

ئەو زمانەیە بۆ بوارێکی زانستیی تایبەت بەکاردەهێنرێت، بۆ نموونە زاراوەکانی زمانەوانی لە ئەندازیاری جیاوازە، زاراوەکانی زانستی پزیشکی لە زانستی پەروەردە جیاوازن، هەروەها زاراوەکانی دەروونزانی لە زانستی فیقە جیاوازی هەیە، زاراوەکانی زانستی کشتوکاڵ لە زانستەکانی بازرگانیدا جیاوازە، زاراوەکانی زانستی کیمیا لە ڕووەکزانی جودایە، ئیتر بەم شێوەیە هەر زانستێك زاراوەی تایبەت بە خۆی هەیە، کە کەم و زۆر لەگەڵ زاراوەکانی دیدا جیاوازی هەیە، ئەم زاراوانەش بە زمانێکی تایبەت هەژمار دەکرێن، کە کەسێك شارەزایی لەو بوارە یاخود ئەو زانستەدا نەبێت، ئەوا دەرکی واتاکەی ناکات، بۆ نموونە گەر پزیشکێك پەرتوکێکی لە زانستی ئەندازیاریدا بەرچاوکەوت، ئەوە لە زاراوەکانی ئەو زانستە تێناگات، هەروەها گەر ئەندازیارێك پەرتووکێك لە بوارەکانی زمانەوانی بخوێنێت، ئەوا تووشی حاڵەتێکی سەخت و دژوار دەبێ.

**٣٤ـ زمانی نموونەیی:**

ئەو زمانەیە، کە هەر بەو شێوەیەی کە دەخوێندرێت، ئاواش دەنووسرێت و هەر بەو شێوەیەش دەنووسرێتەوە کە دەخوێندرێت، زمانەکان لەم بوارەدا لە گەیشتن بە ترۆپکی نموونەیی جۆراوجۆرن، بۆ نموونە زمانی ئینگلیزی زمانێکی نموونەیی نییە، چونکە زۆرجار پیت بەپێچەوانەی نووسین دەخوێندرێتەوە، لەبەرئەوەی هیچ جۆرە گونجانێك لەنێوان دەنگ و پیتەکانیدا نییە، بۆ نموونە پیتی (S) دەنووسین، بەڵام وەکو پیتێکی دی دەخوێنرێتەوە، لەوانەشە پیتەکە (C) بە (S) یان (k) بخوێندرێتەوە، جاری واش هەیە کە پیتەکە دەنووسرێت، بەڵام ناخوێندرێتەوە، دەتوانین بە زمانی کوردی و عەرەبی بڵێین زمانی نموونەیی، چونکە یەك پیت ئاماژە بۆ دەنگێك دەکات و وەکو خۆشی دەنووسرێتەوە و هەر دەنگێکیش بە پیتێك ئاماژەی بۆ دەکرێت.

**٣٥ـ زمانی وەسفی:**

ئەو زمانەیە کە لە وەسفکردنی زمانێکی دیدا بەکاری دەهێنین، بۆ نموونە زمانی عەرەبی یان زمانی کوردی بۆ وەسفکردنی زمانی ئینگلیزی بەکاردێت، کاتێك دەمانەوێ ئینگلیزی فێربین، لەم حاڵەتەدا زمانی عەرەبی یان زمانی کوردی دەبێتە زمانێکی وەسفکار و زمانی ئینگلیزیش دەبێتە زمانی خوێنراو. زمانناسان بەگشتی پەنا دەبەنە بەر ئەم حاڵەتە، ئەویش لەکاتێکدا کە دەیانەوێ زمانی پەرتوکەکە دوو زمان بێت، ئەوان زمانی خوێنەر بۆ وەسفکردنی زمانێکی دی بەکاردەهێنن، گەر زانایەکی ئەمەریکی خوێنەرێکی ئەمەریکی فێر بکات، ئەوا زمانی ئینگلیزی بەکاردەهێنێت بۆ وەسفکردنی هەر زمانێك، بۆ نموونە زمانی عەرەبی یان زمانی کوردی.

**٣٦- زمانی خوێنراو:**

ئـەو زمانەیـە کـە بـۆ خوێندنـەوە و لێکدانـەوە بـەکاردەهێنرێت و دەرەنجـامی خوێندنی زمانەکە بە زمانێکی دی بدرکێندرێت، بەنموونە زمانەکە زمانی عەرەبی یان کوردی بێت، بەڵام بە زمانی ئەڵمانی یان فەرەنسی وەسف بکرێت، یان ئـەم حاڵەتـە بەپێچەوانەوە بێت.

**٣٧- زمانی پسپۆریی:**

ئاماژە بۆ جۆراوجۆری زمان دەکات، کـە پەیوەسـتە بـە بـەکارهێنانی لـە کێڵگـەی تایبەتیدا، وەك پیشەیی یان تەکنۆلۆژی یان بازرگانی و زانست و پزیشکی و ئەنـدازە و کیمیا و فیزیا... هتد. بۆ نموونە ئەندازیارێك یان پزیشکێك ئەو دەربڕین و گوتنانـە بەکاردەهێنێ، کە تایبەتە بە بوارەکەی یان کارەکەی[1].

**٣٨- زمانی گوتن، زمانی دەربڕاو:**

زمانی گوتن یەکێکە لە هۆکارەکانی پەیوەندی زمانی لەگـەڵ زمـانی نووسـراو، بـەوە لێك جیا دەبێتەوە، کە دووبارەکردنەوەی تێدا ڕوودەدات، بەتایبـەتی بـوونی هەنـدێ وشە و هەندێ دەربڕین و وەستان و دوودڵی و خلیسکان...هتد. هەروەها جیـاوازیش لە وشە و ڕۆنان و ڕێزمانیدا هەیە، زمانەوانەکان بایـەخێکی زۆریـان بـە زمـانی گـوتن داوە لە شیکردنەوە و لێکۆڵینەوەکانی زماندا[2].

**٣٩- زمانی خەڵکی (میللی):**

ئەو شێوەیە کە لە دەرەوەی بۆنە و شوێنە ڕەسمییەکاندا بـەکاردێ، وەك (مـاڵ و بازاڕ و ئاهەنگ)، بێ مێژووە و سەربەخۆش نییـە، واتـە ئاخێوەرەکـانی بـە زمـانێکی

---

1- یوسف شەریف سەعید(د)(٢٠١١)، زمانەوانی، ل ٢٤٤.

2- سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٤٤.

سەربەخۆ و جیاوازی لە زمانی یەکگرتوو یان ستاندارد یان دێرینەکە دادەنێن، بەڵام زمانێکی زیندووە[1].

**٤٠ـ زمانی دێرین یان کلاسیك:**

ئەو زمانەیە، کە مێژوویەکی پڕ لە شانازیانەی هەیە و داستان و ئەفسانە لەبارەی بنەچەیانەوە لە ئارادایە، بە پێچەوانەی هەندێ زمانی ترەوە، کە دەستکردن و بێ مێژوویەکی درێژن[2].

لە ڕوانگەی کۆزمانەوانییەوە دابەشکردنێکی نوێ بۆ جۆرەکانی زمان هەیە، کە بەپێی پایە و پلەی کۆمەڵایەتی و ڕووکاری خەڵکی و میرییە، کە بەم شێوەیەی خوارەوەیە[3]:ـ

**١ـ تاکە زمان:**

ئەو زمانەیە کە تەنیا خۆی زمانی میری و نیشتمانییە لە وڵاتدا.

**٢ـ زمانی میری هاوبەش:**

بەو زمانە دەگوترێت کە شانبەشانی زمانی میری و نیشتمانی بەکاردێت.

**٣ـ زمانی میری ناوچەیی:**

ئەو زمانەیە کە لە ناوچەیەکدا پلەی زمانی میری و نیشتمانی هەبێ یان بە ئەرکی ئەو هەڵبستێ.

---

1- محمد معروف فتاح(د)(٢٠٠٨)، زمانی ستاندەرد و زمانی یەکگرتووی کوردی، دەستنووس، ئەکادیمیای کوردی، ل ٤.

2- هەمان سەرچاوە، ل ٤.

3- محمد معروف فتاح(د)(١٩٨٦)، سنوور و بنەما و ئەرکەکانی کۆزمانەوانی، گ. ڕۆشنبیری نوێ، ژ (١١٢)، ل ١٢٥.

**٤ـ زمانی هاندراو:**

ئەو زمانەیە کە هەرچەندە پلەی زمانی میری و نیشتمانی ناوچەیی نییە، بەلام دەزگاکانی ڕاگەیاندن کەلکی لێوەردەگرن و لە دیدار و چاوپێکەوتن و هەندێ بەرنامەی ڕادیۆ و تەلەفزیۆنیدا بەکاری دێنن.

**٥ـ زمانی چاولێپۆشراو:**

ئەو زمانەیە کە دەزگاکانی میری نەهانی بەکارهێنانی دەدەن و نە لە ڕێگەشیدا دەوەستن، بەڵکو چاوی لێدەپۆشن و هەقیان بەسەریەوە نەماوە.

**٦ـ زمانی قەدەغەکراو:**

ئەو زمانەیە کە میری دانی پێ دانەناوە، حەزناکات بەکاربێت و هەوڵی ئەوەش دەدات نەهێڵێ قسەی پێ بکرێ بەتایبەتی لە شوێنە گشتییەکاندا.

## ٦ـ١ : خێزانە زمانەکانی جیهان

زمانناسان، زمانەکانی جیهانیان بەسەر چوار خێزانە زمان دابەش کردووە، کە بەم شێوەیەی خوارەوەیە:[1]

### یەکەم: خێزانە زمانی هیندۆ ـ ئەورووپی

ئەم خێزانە لە کۆمەڵێکی گەورە پێکدێت،کە لە ڕەگەز و بنچینەدا لە یەکترییەوە نزیکن و ئەو گەلانە دەگرێتەوە کە بەم زمانانە دەدوێن و دەکەونە ناوەڕاستی ئاسیا هەتا ئەوپەڕی کەناری ڕۆژئاوای ئەورووپاوە.

أ ـ کۆمەڵی ڕۆژهەڵاتی: بە هیندۆ ـ ئاری ناسراوە، بەهۆیەوە زمانەکانی میتانی و سانسکریتی و ماد و ئەخمینی دەگرێتەوە، کە ئەویش بەسەر دوو لق دابەش دەکرێت:

١ـ کۆمەڵی هیندی: کە لە زمانەکانی (بنجانی، کۆجراتی، بەهاری، بەنگالی، هیندی ڕۆژئاوایی، هیندی ڕۆژهەڵاتی، باراکراتی، راجاسانی) پێکدێت.

٢ـ کۆمەڵی ئێرانی: کە لە زمانەکانی (فارسی کۆن، فارسی نوێ، کوردی، ئەفغانی، بلووجی، ئۆزەتی) پێکدێت.

ب ـ کۆمەڵی ڕۆژئاوایی: ئەم کۆمەڵەیە پێکدێت لە:

١ـ زمانە جەرمەنییەکان: (ئەلمانی، ئینگلیزی، دانیمارکی، هۆلەندی، زمانە ئەسکەندەنافییەکان).

---

[1] ـ بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە ئەم سەرچاوەیەی خوارەوە:

زبێر بیلال، مێژووی زمانی کوردی،وەرگێڕانی لە عەرەبییەوە یووسف ڕەئوف عەلی، چاپخانەی(دار الحرية للطباعة)، بەغدا، ١٩٨٤.

٢ـ زمانە سلاڤییەکان: (ڕووسی، پۆڵەندی، چیکی، سلۆڤاکی، یۆگسلاڤی).
٣ـ زمانی لاتینیەکان یان ڕۆمانییەکان: (ئیتالی، فەرەنسی، ئیسپانی، پورتوگالی).
٤ـ زمانی یۆنانی: (ئەرمەنی، ئەلبانی).
٥ـ زمانی کەڵتی: (ئیرلەندی)

## دووەم: خێزانە زمانی سامی ـ حامی

ئەم خێزانە، زمانی ئەو نەتەوانە دەگرێتەوە، کە لە وڵاتی میزۆپۆتامیا و دوورگەی عەرەبی و ژووررووی ئەفریقیادا دانیشتوون. زانایان زاراوەی (سامی)یان لە ناوی (سام کوڕی نوح)ەوە وەرگرتووە، کە لە (تەورات)یشدا هەر ئەو نەتەوانە دراونەتە پاڵ ئەم ناوە، کە بەم زمانە دواون. ئەم خێزانە زمانەش لەم کۆمەڵە زمانانەی خوارەوە پێکدێت:

١ ـ کۆمەڵەی باشوورییەکان: گرنگترینیان: عەرەبی کۆنی خواروو و شێوە دێرینە لەناوچووەکانی وەکو (سەبەئی، حیبری، قتبانی، سموودی)، عەرەبی نوێی باکوور و زمانی حەبەشی دەگرێتەوە.
٢ـ کۆمەڵەی باکوورییەکان: بریتییە لە ئارامی کۆن و سریانی و سابئە.
٣ـ کۆمەڵی ڕۆژئاوایی یا کەنعانی، کە بریتین لە فینیقی و عیبری.
٤ـ کۆمەڵی ڕۆژهەڵاتی: بریتییە لە ئەکەدی، بابلی، ئاشووری.

## سێیەم: خێزانە زمانی ئۆراڵی

ئەم خێزانە زمانە، دوو کۆمەڵە دەگرێتەخۆ:
١ـ ئۆراڵی: کە زمانی فنلندی و ئەستۆنی و مەجەری دەگرێتەوە.
٢ـ ئەڵتیکی: کە زمانی تورکی، مەگۆلی، تەنوکوسی و مەنانشۆ دەگرێتەوە.

### چوارەم: خێزانە زمانی چینی تێبتی

ئەم خێزانە زمانە، زمانەکانی (چینی، تایلەندی، بورمایی، تێبتی) دەگرێتەوە.

## بەشی دووەم: دیالێکت

### ٢ـ ١: چەمك و پێناسەی دیالێکت

زاراوەی دیالێکت بۆ یەکەمجار لەلایەن یۆنانییەکانەوە لە شێوەی (Dialektos) بەکارهاتووە، بۆ جیاکردنەوەی زمانی نووسین لە زمانی چینەکانی خوارەوەی کۆمەڵگە بەکارهێنراوە، بە زمانی ڕەسمی و ئەدەبییان وتووە (Dialektos) و، زاراوەی (Patois)یان بۆ زمانی چینەکانی خوارەوەی کۆمەڵگە بەکارهێناوە[1].

ئەم زاراوەیە لە سەدەی شازدەهەم لە سەردەمی ڕاپەڕین (ڕێنساس) بۆ گفتوگۆکردن لە بارەی سامانی ئەدەبی ناوچەییەوە بەکارهاتووە، بەهۆیەوە لەم سەردەمەدا وشیاریی ناوچەیی گەشەی کرد و هەوڵدان بۆ جیاوازی کردن لە نێوان (زمان و دیالێکت) بە بلاوی ئیشی لەسەر کرا[2].

لە زمانی کوردیشدا جگە لە زاراوەی دیالێکت، ئەوا زاراوەکانی (زار، شێوەزار، شێوە) بەکاردەهێنرێت، لە زمانی ئینگلیزیش زاراوەی (Dialect) و لە زمانی عەرەبیش زاراوەی (لەهجە) و لە زمانی فارسیش زاراوەی (گویش) بەکاردەهێنرێت.

زمانێکی جێگیر و لەقاڵبدراو و بێ گۆڕانکاری نییە، هەموو زمانەکانی جیهان دیالێکت و شێوەزاری جیاجیا دەگرنە خۆ. کاتێکیش زمانی بەکارهێنراوی کۆمەڵێك

---

[1]- عەبدولمەناف ڕەمەزان ئەحمەد(٢٠٠٩)، ئەتڵەسی زمانی - هەرێمی کوردستانی عێراق وەك نموونە، نامەی ماستەر، ل ١٠، ئەویش وەریگرتووە لە Dialetology, J. K. Chambers and Peter Trudgill, p. 3.

[2]- بەکر عومەر عەلی(د) و شێرکۆ حەمە ئەمین (٢٠٠٧)، زار و شێوەزار، چاپی دووەم، چاپخانەی چوارچرا، سلێمانی، ل ٧.

لە کۆمەڵێکی تر لە نێو چوارچێوەی هەمان زمان جیاوازیی ئاشکرای هەبێت، ئەوە ئەو جیاوازییە پێی دەوترێت دیالێکت.[1]

هەروەها بۆ دیاریکردنی دیالێکتەکانی زمانێك تەنیا پێوەرە زمانەوانییەکان بڕیاردەرنین لەسەر ناسنامەی ئەو دیالێکتە، بەڵکو پەیوەندییە ئەتنیکی و کلتووریی و کۆمەلایەتی و مێژووییەکان بڕیاری یەکلاکەرەوە دەدەن.[2]

زمانناسان لە بارەی پێناسەکردنی دیالێکت، هەریەکەیان بەپێی ڕوانگە و بۆچوونی تایبەتییەوە پێناسەیان کردووە، بەو واتایەی لە کۆمەڵێ ڕوانگەی جۆراوجۆرەوە لە دیالێکت کۆڵدراوەتەوە و پێناسەی بۆ کراوە، لەوانە (کۆمەلایەتی، ئابووری، دەروونی، سیاسی، مێژوویی، زمانەوانی،... هتد). بۆیە ئێمەش لێرەدا هەوڵدەدەین هەندێ لە پێناسەکانی دیالێکت بخەینەڕوو:

کامیل حەسەن بەسیر لە کتێبی (زمانی نەتەوایەتی کوردی)دا، بەمشێوەیە پێناسەی دیالێکتی کردووە:((شێوەی لێدوان و قسەکردنی کۆمەڵە خەڵکێکە لە نەتەوەیەکدا و ئەم شێوە لێدوان و قسەکردنەش هەرچەندە، چەند تایبەتییەکی دەنگسازی و وشەسازی و ڕستەسازی خۆی هەیە، بەلام لە هەمان کاتدا بەشێکە لە زمانی نەتەوەیی ئەو خەڵکە و پەیدابوونی دیاردەیەکی سروشتییە))[3].

---

1- غازی عەلی خورشید(٢٠١٢)، زمانی فەرمی بۆ کوردستان، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی، ل ٢٤.

2- سوداد ڕەسوڵ(٢٠١٢)، هەورامی لەهجەیە یان زمان؟ ، گ. زمانناسی، ژ. (١٣)، ٢٠١٢، ل ٢٨.

٣- کامل حسن بصیر(د)(١٩٨٤)، زمانی نەتەوایەتیی کوردی، چاپخانەی کۆڕی زانیاری عێراق، بەغدا،ل ١٥.

یوسف شەریف سەعید لە کتێبی (زمانەوانی)دا، بەمجۆرە پێناسەی دیالێکتی کردووە: ((دیالێکت شێوەیەکە لە شێوەیەکانی زمانی ناوچەیی یان کۆمەڵایەتی یان کاتی، کە پێکهێن و دانەکانی ڕۆنان و ڕێزمانی تایبەتی هەیە))[1].

بەکر عومەر عەلی و شێرکۆ حەمە ئەمین لە کتێبی (زار و شێوەزار)دا، بەمشێوەیە پێناسەی دیالێکتیان کردووە:((دیالێکت بوارێکی تەسکتر و پانتایەکی سنوورداری ئەندامانی ئەو نەتەوەیە دەگرێتەوە، کە بە زمانە گشتییەکە قسە دەکەن))[2].

محەمەد مەعروف فەتتاح لە کتێبی (زمانەوانی)دا، بەمشێوەیە پێناسەی دیالێکتی کردووە:((دیالێکت بەو شێوە زمانە دەوترێ، کە کۆمەڵە کەسێك لە شوێنێکدا بەکاری دێنن و هاوزمانەکانیشیان تێیان دەگەن))[3]، هەروەها (محەمەد مەعروف) لە شوێنێکی تردا بەم شێوەیە پێناسەی دیالێکتی کردووە: ((شێوەیەکی زمانە، کە بەندە بە ناوچەیەکەوە، بەهۆی واژە و پێکهاتەی ڕێزمانی دەناسرێتەوە و گۆکردنێکی جیاوازیشی هەیە، هەر زمانێك قسەپێکەرانی زۆربێت دیالێکت پەیدا دەبێت، بەتایبەتی کە هۆکاری جوگرافی بێتە بەردەم و خەڵکەکە لە یەکتر جیابکاتەوە))[4].

کەمال میراودەلی لە کتێبی (فەرهەنگی ڕێزمانی کوردی)دا، بەمشێوەیە پێناسەی دیالێکتی کردووە:((دیالێکت شێوەیەکی دیار و جیاکراوەی قسەکردن و ئاخاوتنە، لە چوارچێوەی یەك زماندا، کە قسەکەرانی ناوچەیەك جیا دەکاتەوە، یاخود کاتێ

---

[1]- یوسف شەریف سەعید(د)(٢٠١١)، زمانەوانی، ل ٢٤٧.

[2]- بەکر عومەر عەلی(٢٠٠٧)، هەمان سەرچاوە، ل ١٣.

[3]- محمد معروف فتاح(١٩٩٠)، زمانەوانی، چاپخانەی (دار الحكمة)، بەغدا، ل ١٠٥.

[4]- محمد معروف فتاح(د)(٢٠٠٨)، زمانی ستاندەرد و زمانی یەکگرتووی کوردی، دەستنووس، ئەکادیمیای کوردی، ل ٤ — ٥.

چینێکی تایبەتی بەشێوەیەکی وا دەدوێن کە زۆر سیما و خاسێتی جیاکەرەوەی لە چینەکانی دی هەیە))[1].

ڕەفیق شوانی لە کتێبی (چەند بابەتێکی زمان و ڕێزمانی کوردی)دا، بەمشێوەیە پێناسەی دیالێکتی کردووە: ((دیالێکت بریتییە لە شێوەی جیاوازی قسەکردن، لە مرۆڤێکەوە بۆ مرۆڤێکی تر))[2].

ئەحمەد ئەسعەد نادری لە بارەی دیالێکتەوە دەڵێت:((دیالێکت کۆمەڵە تایبەتمەندییەکی زمانییە، سەر بە ژینگەیەکی تایبەتە و هەموو تاکەکانی ئەو ژینگەیە لەو تایبەتمەندییانەدا بەشدارن))[3].

محەمەد حوسێن عەبدولعەزیز بەمشێوەیە پێناسەی دیالێکتی خستۆتەڕوو:((دیالێکت شێوەیەکی زمانی تایبەتە، کە تاکەکەسێك بەکاری دێنێت، بەمەش تاکەکەسەکە لە کۆمەڵگەیەکی زمانیدا تایبەتمەندی خۆی دەبێت))[4].

ئینسکلۆپیدیای زمانناسی کامبریج بەمشێوەیە پێناسەی دیالێکتی کردووە:(( شێوە ئاخاوتنێکی سەر بە زمانێکە کە ئەو زمانە لەلایەن کۆمەڵێك خەڵکەوە قسەی پێ

---

[1]- کەمال میراودەلی(د)(٢٠٠٧)، فەرهەنگی ڕێزمانی کوردی، لە بڵاوکراوەکانی مەڵبەندی کوردۆلۆجی، سلێمانی، ل ٤٥.

[2]- ڕەفیق شوانی(د)(٢٠٠١)، چەند بابەتێکی زمان و ڕێزمانی کوردی، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی موکریانی، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ل ٦٦.

[3]- احمد اسعد النادري(د)(٢٠٠٥)، فقه اللغة ـ مناهله و مسائله، المكتبة العربية، بيروت ـ لبنان، ص ١٤.

[4]- محمد حسين عبدالعزيز(د)(١٩٨٣)، مدخل الى علم اللغة، دار النمر للطباعة، القاهرة ـ مصر، ص ١٥٩.

دەکریّ، کۆمەڵێك ڕەفتاری زمانیی و مەعریفەیی هاوبەشی لەگەڵ ئەو کۆمەڵە خەڵکە هەیە ))[1].

کەواتە لەم پێناسانەی پێشوودا دەردەکەوێت، کە: دیالێکت شێوەی جیاوازی ئاخاوتنە لە چوارچێوەی یەك زماندا، کە دەبێتە تایبەتمەندییەك و بەهۆیەوە ئاخێوەرەکانی ناوچە جیاوازوکانی تاکە زمانێك لە یەکتر جیادەکرێتەوە.

---

1– سوداد ڕەسولّ(٢٠١٢)، هەورامی لەهجەیە یان زمان؟ ، گ. زمانناسی، ژ. (١٣)، ٢٠١٢، ل ١٥.

## ٢ ـ ٢: جۆرەکانی دیالێکت

دەکرێ جۆرەکانی دیالێکت بەسەر ئەمانەی خوارەوەدا دابەش بکەین[١]:-

**١ـ دیالێکتی جوگرافی:**

بڵاوبوونەوەی خەڵکی لە چوارچێوەیەکی جوگرافی فراواندا، دەبێتە هۆی دروستبوونی کەلێنی فراوان لەنێوان دیالێکتە جۆراوجۆرەکاندا، هەرچەند ماوەی نێوان قسەکەرانی یەك زمان زیاد بکات، ئەوا ژمارەی دیالێکتەکانی ئەو زمانە زیاتر دەبێت، لەهەمان کاتیشدا جیاوازی نێوان ئەم دیالێکتانە پتر دەبێت، جا ئەو دیالێکتانەی کە لە مەودای شوێنەوە سەرهەڵدەدەن، دیالێکتی جوگرافیی یان هەرێمی ناودەبرێت. واتە هەر ناوچەیەك لەگەڵ ناوچەیەکی تر، شێوازی ئاخاوتنی جیایە، بەجۆرێك هەندێ وشە و زاراوە لەناوچەیەکی دیاریکراو بەکاردێ، بەبێ ئەوەی لە ناوچەکانی تر بەکاربێت[٢]. هەروەها ئەم دیالێکتە بە دیالێکتی (خۆجێی)ش ناودەبرێت، وەکو کوکنی (Cockney) لە لەندەن[٣].

هەروەها کاریگەریی هەرێمێك لەسەر زماندا لە هاوسنووری ئەو هەرێمە لەگەڵ هەرێمێکی دیکە پەیدا دەبێت، بۆ نموونە دانیشتوانی (عێراق) لەگەڵ زمانی فارسی و تورکیدا هاوسنوورن، ئەویش لەبەر هۆکاری جوگرافیی، بەرانبەر بەمەش دانیشتوانی وڵاتێکی وەك (مەغریب) لەگەڵ ئەم دوو زمانەدا هاوسنور نین، بەڵام لەگەڵ زمانی

---

[١]- محمد علي الخولي (د)(٢٠٠٠)، مدخل الى علم اللغة، دار الفلاح للنشر والتوزيع، اردن، ص ١٦٣ — ١٦٨.

[٢]- سەلام ناوخۆش و نەریمان خۆشناو و ئیدریس عەبدوڵلا (٢٠١٠)، کوردۆلۆجی، چاپی شەشەم، چاپخانەی ڕۆژهەلات، هەولێر، ل ٧٢.

[٣]- یوسف شەریف سەعید(د)(٢٠١١)، ل ٢٤٨.

فەڕەنسی و ئیسپانی هاوسنوورن، لەبەرئەوە هاوسنووربوونی زمانەکان بۆ هەر هەرێمێك یەکێکە لە فاکتەرە سەرەکییەکانی جیاوازی دیالێکت لە زماندا.

ئەو فاکتەرانەی کە دەبنە هۆی سەرهەڵدانی دیالێکتی جوگرافی، ئەمانەن:

أ ـ فاکتەری گۆشەگیری جوگرافی: ئەگەر لەمپەرێکی جوگرافی لەنێوان دوو هەرێمدا دروست بوو، کە بە هەمان زمان قسە دەکەن، ئەوە ئەو لەمپەرە جوگرافییە گۆشەگیرییەکی ڕێژەیی دروست دەکات، کە پەیوەندییە مرۆییەکان کەمتر دەکاتەوە یان هەر نایهێڵێت، کە ئەمەش دەبێتە هۆکاری دروستبوونی دیالێکتی جوگرافی، وەکو دەریا و بیابان و چیاکان، کە لەمپەری جوگرافین.

ب ـ فاکتەری گۆشەگیری سیاسی: ئەگەر سنووری سیاسی لەنێوان دوو هەرێمدا دروست بوو، کە یەك زمانیان هەیە، یان جوڵەی دانیشتوانی ئەو هەرێمە سنووردار کرا و، ئەم حاڵەتەش ماوەیەکی زۆری خایاند، ئەوە جیاوازی لە نێوان دیالێکتەکان دروست دەبێت. ئەوەی ڕاستی بێت دیالێکتی جوگراف لە زمانە جۆراوجۆرەکان دروست دەبێت، هەرچەندە ڕووبەری ئەو وڵاتەش بچووك بێت، بۆ نموونە هەر وڵاتێکی عەرەبی دیالێکتێکی تایبەت بە خۆی هەیە، وەکو دیالێکتی عێراقی، سووری، میسری، فەلەستینی، تونسی، بگرە لە هەر شارێکی سەرەکی وڵاتێکدا یەك دیالێکت هەیە، کە لەوانی تر جیای دەکاتەوە، بەجۆرێك دەتوانرێت بەهۆی ئەو دیالێکتەوە وڵاتی یان شاری قسەکەرەکە بزانرێت.

**٢ـ دیالێکتی کۆمەڵایەتی:**

چەندەها جیاوازی لەنێوان خەڵکیدا لەڕووی کۆمەڵایەتی و ئابووری و ڕۆشنبیرییەوە هەن، فاکتەری ئابووری و ئاستی ڕۆشنبیری تاك کاریگەری لەسەر دیالێکتەکەی هەیە، لەبەر ئەوە زۆر بە ئاسانی دەتوانی قسەکەری خوێندەوار و فاکتەری نەخوێندەوار لەکاتی قسەکردندا لەیەکدی جیا بکەیتەوە، دیالێکتی هەڵگری

بڕوانامەی زانکۆ لەگەڵ نەخوێندەواردا جیاوازی هەیە، دیالێکتی نوخبە لەگەڵ مرۆڤی ئاسایی زۆر جیایە، دیالێکتی ئاستی ڕۆشنبیری و کۆمەڵایەتی، خاوەنەکەی جیا دەکاتەوە. واتە ئەم جۆرە دیالێکتە پەیوەندی بە ئاستی ڕۆشنبیری و خوێندن و لایەنی نەتەوەییەوە هەیە، کەواتە بەگوێرەی بەرزی ئاستی ڕۆشنبیری کەسێك لەگەڵ کەسانی تر جیاوازی لەنێوان ئاخاوتنیان دەبێت[1].

### ٣ـ دیالێکتی تاکەکەسی:

ئەگەر دوو کەس سەر بە هەرێمێکبن، بگرە لە گەڕەکێکدا بژین، یان دوو برا و لەیەك ماڵدا ژیان ببەنە سەر و یەك ئاستی خوێندەوارییان هەبێت، ئەوا چەندەها جیاوازی لە شێوەی قسەکردنیاندا هەیە، هەریەکەیان بەشێوەیەکی تایبەت قسە دەکەن، کە لەوی دی جودای دەکاتەوە، ئەم دیالێکتە تایبەتە، مرۆڤ لە برادەر و خزم و دراوسێ و برادەران جودا دەکاتەوە. کەواتە ژمارەی دیالێکتی تاکەکەسی بەقەد ژمارەی قسەکەرانە.

### ٤ـ دیالێکتی ڕەچەڵەکی:

ئەگەر لە شوێنێکدا کەمینەیەك هەبێت، ئەوا ئەو کەمینەیە دیالێکتی باڵادەستەکە بەشێوەیەکی تایبەت بەکاردەهێنێت، ئەم دیالێکتە تایبەتەش لە تێکەڵکێشکردنی زمانی کەمینە و زمانی زۆرینەوە پەیدا بووە، ئەم تێکەڵکێش بوونە دیالێکتێکی تازە دروست دەکات. بە نموونە ڕەشپێستەکانی ئەمەریکا دیالێکتێکی تایبەت بە خۆیان هەیە، کە بە (دیالێکتی ڕەشپێستەکان) یان (ئینگلیزە ڕەشپێستەکان) ناودەبرێت، هیندییەکان لە ئەمەریکا بەشێوەیەك قسە دەکەن، کە دەکرێ ناوی بنێین (ئینگلیزی هیندی)، تورکەکان لە ئەڵمانیا بە زمانێکی ئەڵمانی تایبەت قسە دەکەن، کە لەگەڵ

---

[1]- سەلام ناوخۆش و نەریمان خۆشناو، هەمان سەرچاوە، ل ٧١.

ئەڵمانی ئەڵمانییەکان جیاوازی هەیە و دەتوانین بە دیالێکتەکەیان بڵێین (ئەڵمانی تورکی).

**٥- دیالێکتی پیشەیی:**

هەر پیشەیەك زاراوەی تایبەتی خۆی هەیە، هەر پیشەیەك دیالێکتی تایبەت بەخۆی هەیە، ئەندازیارەکان زاراوەی وا بەکاردەهێنن، کە لە زاراوەکانی پزیشکیدا بەکارناهێنرێت، ئەو زاراوانە تایبەت بە زاراوەی ئەندازیارین و پەیوەندییان بە بواری تری وەك کشتوکاڵ و یاسا و ژمێریارییەوە نییە، چونکە لەوانەیە زۆرجار کەسێك نازانێ لە دەوروپشتیدا چی دەوترێت (تەنانەت بە زمانی زگماکی خۆیشی قسەکان دەوترێت)، ئەویش لەبەر دیالێکتی پیشەییە، وەك ئەوەی زۆرجار پزیشکەکان لە بەرانبەرت قسەیەك دەکەن، لەوانەیە قسەکە سەبارەت بە تۆش بێت، بەڵام نازانی ئەوان چ دەڵێن، کە زمانی پیشەیی پزیشکی بەکاردەهێنن. واتە هەر پیشەیەك خاوەنی شێوازی ئاخاوتنی خۆیەتی، کە بەهۆیەوە لەگەڵ ئاخاوتنی پیشەکانی دی جیادەکرێنەوە، بۆ نموونە:((پزیشك، فیتەر، ئەندازیار، مامۆستا، کرێکار،...هتد)). هەریەکەیان کۆمەڵێ وشە و زاراوە بەکاردەهێنن، کە تایبەتە بە ئاخاوتنی خۆیانەوە، بۆ نموونە گەر ئاخاوتنی پیشەیی زێرینگری وەرگرین، دەبینین وشەکانی(عەیار، مسقال، حەبە، سەنت،... هتد) بەکاردەهێنرێت، لەهەمان کاتیشدا گەر پیشەی مامۆستایی وەرگرین، دەبینین دەیەها وشەی تر بەرچاومان دەکەوێت و بەکاردێت، کە جیایە لەگەڵ پیشەکانی تر، وەکو (تەباشیر، ڕەحلە، ماجیك... هتد)[1].

---

[1]- سەرچاوەی پێشوو، ل ٧١.

**٦ـ دیالێکتی تەمەنی:**

ئایا منداڵی تەمەن سێ ساڵ لەڕووی ڕێزمان و سیستەمەکانی چۆن قسە دەکات، چۆن مامەڵە لەگەڵ زمان دەکات؟ لەبەر ئەوەی شێوەی ئاخاوتنی منداڵ جیاوازە لەگەڵ گەوران، منداڵ لە قۆناغی منداڵیدا بەو شێوەیەیە کە گەورە دەیانەوێ، منداڵ لە کێبرکێدایە لەگەڵ زماندا لەڕووی دەنگ و وشە و ڕێزمانەوە، ئەو لە هەوڵداندایە بۆ لاساییکردنەوەی جووڵە بە بیرکردنەوە، بەشێوەیەك کە دەرەنجام دیالێکتێکی تایبەتی بۆ دروست دەبێت، کە لەگەڵ دیالێکتی گەورەکاندا جیاوازییەکی بۆ دروست دەبێت.

**٧ـ دیالێکتی ڕەگەزیی(جێندەر):**

قسەکردنی پیاو لە قسەکردنی ئافرەت جیاوازە، دەربڕینی ئافرەتان لەگەڵ دەربڕینی پیاوان جیاوازی هەیە، چ لە ڕووی شێواز و چ لە ڕووی جووڵەکانی لکاو بە زمانەوە، هەروەها لە ڕووی پلەی دەنگی لە بەکارهێنانی هەندێك وشە، لە بەکارهێنانی دەنگی سەرسوڕمان یان گوزارشەکانی سەرسوڕمان، ئەم وردەکاریی و جیاوازیانە وا دەکەن کە دیالێکتێك بۆ پیاوان و دیالێکتێك بۆ ژنان لەسەرتاپای زمانەکاندا دروست ببێ، واتە پیاوان بە زمانێك قسە دەکەن جیاوازە لە هی ئافرەتان.

**٨ـ دیالێکتی کاتی:**

گەر بڕوانینە زمانێك و لە مێژووی هەزار ساڵەی ئەو زمانە بکۆڵینەوە، لەڕووی لۆجیکیەوە وا پێشبینی دەکرێت ئەو زمانە بە چەند دیالێکتێکی جۆراوجۆر قسەی پێکراوە، لەوانەشە هەندێك لەو دیالێکتانە ئێستا نەمابێ، کە هەندێك لەو دیالێکتانە تاکو ئێستا ماون و قسەیان پێ دەکرێت، ئەوانە دیالێکتی زیندوون، بەڵام سەبارەت بە دیالێکتە لەناوچووەکان سەختە کە باس بکرێن، چونکە دەنگەکانیان

تۆمارنەکراون، کەچی زمانەوانی مێژوویی باس لەو مەسەلەیە دەکات و هەوڵدەدات ئەو دیالێکتانە دەست نیشان بکات.

**٩ـ دیالێکتی لادێیی و دیالێکتی شارستانی:**

لە هەر هەرێمێکدا چەندەها شار و لادێ هەن، لە زۆر حاڵەتیشدا دیالێکتی شار لە دیالێکتی لادێ جیاوازترە، هەر وڵاتێك لەو بوارەدا دەتوانێت دیالێکتی گوندان و شارنشین لە یەك ناوچەی جوگرافیدا جیا بکاتەوە، ئەمەش بۆ دوو هۆکار دەگەڕێتەوە: یەکەمیان، ئەوەیە کە دانیشتوانی شار زیاتر لەگەڵ خەڵکی دی تێکەڵ دەبن و لە گوندەکان زیاتر تێکەڵییان هەیە، چونکە شار سەنتەری گوندەکانە، بەمشێوەیە شار دەبێتە کەناڵێکی گەیشتنی ژمارەیەکی زۆری خەڵکی، کە خاوەن ڕۆشنبیریی و شێوەزارگەلێکی چڕن، دووەمیش، بەگشتی شارنشینەکان ئاستی ڕۆشنبیرییان بەرزترە، ئەم دوو هۆکارە دەبنە هۆی ڕوودانی جیاوازی لەنێوان دیالێکتی لادێیی و دیالێکتی شار.

**١٠ـ دیالێکتی ڕەمەکی:**

هەموو زمانێك دیالێکتی ڕەمەکی هەیە، ڕەمەکی دیالێکتێکی دیاریکراوە، کە خەڵك ڕۆژانە قسەی پێدەکەن، ئەم دیالێکتە زمانی ئاخافتنە لە بازاڕ و لە ماڵدا و، زمانێکی نافەرمییە و لە کورتە ڕستە و وشەی بەکارهێنراو و پێکهاتە سادەکان دروست بووە و بەرانبەرەکەشی زمانی پەتییە. واتە بەو قسە و ئاخاوتنانە دەوترێت، کە لەسەر شەقام و کۆڵانەکان و گازینۆ و بازاڕ و چایەخانەکان بەکاردێت، ئەمجۆرەیان لە ئاخاوتندا شێوەیەکی ڕەمەکی پێوە دیارە ، بە واتایەکی تر ئەمجۆرەیان لەهەموو جۆرەکانی تری دیالێکت نزمترە.[1]

---

[1] - سەرچاوەی پێشوو، ل ٧٢.

**١١ـ دیالێکتی پەتی:**

دیالێکتی پەتی زمانی ئەدەب و زانستە، زمانی فێرکردن و وانەوتنەوەی زانکۆکانە. ئەم جۆرە دیالێکتە قسە و ئاخافتنی ڕەمەکی و بازاڕیی و پڕوپووچی تێدا نییە و، وردەکارییەکی زۆری تیادایە لەڕووی هەڵبژاردنی وشە و ڕەسەنایەتی ڕێزمانی. لەزۆر زماندا کەلێنەکانی نێوان ڕەمەکی و پەتی زۆرن و لە هەندێ زمانی دیشدا کەلێنەکان کەمن. واتە بەو دیالێکتە دەوترێ کە دەبێتە شێوەیەکی فەرمی، بەهۆیەوە نووسین و خوێندن بەمجۆرە دیالێکتە دەبێت، هەر بۆیەشە هەندێ جار بەم دیالێکتە دەوترێ دیالێکتی فەرمی.[1]

**٢ ـ ٣ : جیاوازی نێوان دیالێکتەکان**

لە نێو دیالێکتەکانی یەك زماندا، چەندەها جیاوازی لەچەندەها بواری جۆراوجۆردا هەن، کە ئەمانەن[2]:

**١ـ جیاوازی دەنگی:**

دیالێکتەکان جیاوازییان لە بواری دەنگدا هەیە، ئەوەی زانراوە کە دەنگەکان لە زماندا بۆ دوو بەش پۆلێن دەکرێت: دەنگی چەسپاو کە لە زمانێکەوە بۆ زمانێکی دی ناگۆڕدرێن، وەکو (م، ب، س) لە زمانی عەرەبیدا. دەنگی گۆڕاو کە لە زمانێکەوە بۆ زمانێکی دی گۆڕانکارییان بەسەردا دێت، وەکو (ق، ث، ج، ذ) لە زمانی عەرەبیدا، بۆ نموونە (ق) لە زمانی عەرەبیدا لەوانەیە بە (ق) یان (گ) یان (ء) بدرکێنرێت. دەنگی (ث) بە(ث) یان(ت) یان(س) بدرکێندرێت، یان (ج) لەوانەیە وەك (ج) یان (گ) بەکاربهێنرێت، یان (د) لەوانەیە بە(ذ) یان وەکو (ز) بدرکێندرێت.

---

[1]- سەرچاوەی پێشوو، ل ٧٢.

[2]- محمد علی الخولي (د)، مدخل الی علم اللغة، ص ١٦٦ — ١٦٨.

هەروەها هەموو (ك)ێکی پێش (ێ) بە دەنگی (چ) دەخوێندرێتەوە، هەروەها لە کرمانجی ژوورووش، لە زۆر حاڵەتدا (و) دەبێ بە (ڤ).وەکو: چاو← چاڤ

**٢- جیاوازی ڕێزمانی:**

لەوانەیە دیالێکتەکانی سەر بە یەك زمان لە بواری ڕێزمانیشدا جیاوازبن، ئەم جیاوازییانە لەنێوان دیالێکتە ڕەمەکییەکانی یەك زماندا هەر لەزیادبووندان، هەروەك زۆر بە ڕوونی جیاوازی لەنێوان دیالێکتی ڕەمەکی و دیالێکتی پەتی لە زمانی کوردیدا دەردەکەوێت. تەنانەت جیاوازی ڕێزمانیش لە نێوان کرمانجی سەروو و کرمانجی ناوەڕستدا هەیە، وەکو جێناوە کەسییەکان لە کرمانجی سەروو دوو کۆمەڵەیە، کەچی لە کرمانجی ناوەڕستدا یەك کۆمەڵەیە، و جێناوی لکاویش لە کرمانجی سەروو یەك کۆمەڵەیە، کەچی لە کرمانجی ناوەڕاستدا چوار کۆمەڵەیە[1].

**٣- جیاوازی وشەیی:**

هەندێك دیالێکت هەن کە وشەگەلێك بەکاردەهێنن لە شێوەزارەکانی دیدا بەکارناهێنرێت، بۆ نموونە لە کوردی پەتیدا دەڵێین (ڕۆیشت)، بەلام لە ڕەمەکیدا دوترێ (ڕۆیی)، لە کوردی پەتیدا دەڵێین (لەکوێ)، بەلام لە ڕەمەکیدا دەڵێین (لەکێندەر). هەروەها لە پەتیدا دەڵێین (ئەوە)،بەلام لە ڕەمەکیدا دەڵێین (ئەوێهێ) و لە پەتیدا دەڵێین (ئەوانە)، بەلام لە ڕەمەکیدا دەڵێین (ئەوانێهێ)، بەمجۆرە هەزارەها نموونە هەن کە دەلالەت دەکەنە سەر جیاوازییەکانی وشە لەنێوان دیالێکتەکانی یەك زماندا.

[1]- نەریمان عەبدوللا خۆشناو(٢٠١٠)، ڕێزمانی کوردی - بەشەکانی ئاخاوتن، چاپی دووەم، چاپخانەی منارە، هەولێر، ل ٣٦ – ٣٧.

### ٢ ـ ٤: هۆکارەکانی پەیدابوونی دیالێکت

بێگومان کۆمەڵێ هۆکار هەن، کە دەبنە هۆی دروستبوونی دیالێکت و پەرەسەندنی لە نێو زماندا، لێرەدا باسی هەندێ لەو هۆکارانە دەکەین[1]:

**١ـ هۆکاری کۆمەڵایەتی:**

ئەمە پەیوەندیی بە نەریت و خووڕەوشتی ناو کۆمەڵگە و دابەشبوونی چینەکانی کۆمەڵگاوە هەیە، لەبەرئەوەی دانیشتوانی ناوچەکان لە ڕووی نەریت و خووڕەوشت و دەستووره کۆمەڵایەتییەکان و ئەندازەی ڕۆشنبیریی و بیرکردنەوە جیاوازن، ئەم جیاوازییە دەبێتە هۆی جیابوونەوەی دیالێکتەکە.

**٢ـ هۆکاری سیاسی:**

دوو لایەن دەگرێتەوە:

أ ـ میللەتێك خاوەنی حکومەتێکی ناوەندی نەبێت، بەڵکو لە قۆناغێکی گواستنەوەدا بێت.

ب ـ حکومەتی ناوەندی بوونی هەیە، بەڵام لەبەر فراوانی سنووری دەسەڵاتەکەی، ناتوانێت دەسەڵاتی بەسەر هەموو ناوچەکاندا بسەپێنێت، بۆیە دەسەڵاتی ناوەند لاواز دەبێت، واتە فراوانبوونی دەوڵەت و زۆربوونی ناوچەکانی و جیاوازی گەلەکانی ژێر دەسەڵاتەکەی، دەبێتە هۆی لاوازبوونی دەسەڵاتی دەوڵەتەکە بەسەر ناوچەکانی تریەوە، ئەم هۆیەش دەبێتە پارچەبوونی، دابەشبوونی وڵات بەسەر هەرێم و ویلایەت

---

[1]- بۆ ئەم بابەتە بڕوانە:ـ أـ عەبدولواحد ئەلوافی(د)(٢٠٠٧)، زانستی زمان، و: د.ئیبراهیم عەزیز ئیبراهیم، لە بڵاوکراوەکانی وەزارەتی ڕۆشنبیری، چاپخانەی ڕۆشنبیری، هەولێر، ل ١٩٥ ـ ١٩٦.
ب ـ بەکر عومەر عەلی(د) و شێرکۆ حەمە ئەمین (٢٠٠٧)، زار و شێوەزار، چاپخانەی چوارچرا، سلێمانی، ل ٨ — ٩.

و ئیمارات و ولاتی بچووکتر دابەش دەبێت، ئەمەش بەهۆیەوە وا دەکات کە هەر شوێن و ناوچەیەك ببێتە خاوەنی شێوە ئاخاوتنێکی تایبەت.

**٣- هۆکاری جوگرافیایی و سروشتیی هەڵکەوتوویی ناوچەکە:**

ئەمەش لە دانیشتوانی ناوچە جیاوازەکاندا دەبینرێت، کە لەژێر باری ئاو و هەوا و رووبار و دەریا و شاخ و چیا و لایەنی تری سروشتی ولاتدایە، دواجار ئەم جیاوازی سروشتییە وا دەکات جیاوازی شێوازی زمانیش دروست ببێت.

**٤- رادەی رۆشنبیریی و دواکەوتوویی کۆمەڵگە:**

وا دەبێت شوێنێ لەچاو شوێنێکی تری ولاتەکە لە رووی لایەنی رۆشنبیریی و خوێندنەوە جیاوازبێ، کە ئەم جیاوازییەش دەبێتە هۆی جیاوازیی بیرکردنەوە و ئاخاوتنی یەکتری.

**٥- جیاوازی لەرووی لایەنی دەنگسازییەوە:**

واتە لەرووی فۆنیمەوە جیاوازییان دەبێ، ئەم جیاوازییەش لەرووی ژمارەی فۆنیمەکانەوە نییە، بەڵکو لەرووی گۆرینی فۆنیمەکانەوە دەبێت، بۆ نموونە لە کرمانجی ناوەراستی زمانی کوردیدا وشەی (نووسی) بەکاردێ، بەلام لە کرمانجی سەرووی زمانی کوردیدا (نڤیسی) بەکاردێ.

**٦- هۆکاری ئابووریی:**

بەهۆی جیاوازی چالاکی و ئیش و کار و پیشەی جیاجیای خەڵك لەناو کۆمەڵدا، وەکو ئەوەی هەر جۆرە چین و توێژ و تاقم و کۆمەڵە خەڵکێکی هاوکار و هاوپیشە، دیالێکتێکی تایبەتییان بۆ دروست دەبێت، کە هەر پیشەیەك وشە و زاراوە و دەربرینی تایبەت بەخۆی هەیە و دیالێکتی بچووك پەیدا دەکەن[1].

---

[1]- رەفیق شوانی(د)، هەمان سەرچاوە، ل ٧٠.

**٧ـ هۆکاری میللی:**

لـەناو دانیشـتوانی ناوچـە جیاوازەکانـدا دەردەکـەوێت، وەك جیـاوازی لـە نێـوان خەڵکەکە، لە ڕووی تیرە و تایەفە و هۆزەوە، کە هەریەکە سەر بـە جـۆرە تیرەیەکـە و، جیاوازی نێوان خەڵکی ناوچەکە دەبێتە هۆی پەیدابوونی دیالێکت لەناو زماندا[١].

**٨ـ هۆکاری کەسی و جیاوازی قسەکردن:**

تایبەتێتی و کەسایەتی مرۆڤ وا دەکات، کە هەڵسوکەوتی مرۆڤێك جیـاواز دەبێـت لـە هەڵسوکەوتی مرۆڤێکی تر، ئەم تایبەتییە لە قسەکردنیشـدا دەردەکـەوێت، ئەمـە لـە ژیانی ڕۆژانە بۆمان دەرکەوتووە، کە دەنگ و شێواز و قسەکردنی کەسێك، لە دەنـگ و دەربڕین و شێواز و ئاخاوتنی کەسێکی تر جیاوازە و ئەم جیاوازییە لە کەسـێکەوە بۆ کەسێکی تر دەگرێت[٢].

---

[1]- هەمان سەرچاوە، ل ٦٨.

[2]- هەمان سەرچاوە، ل ٦٨.

**٢ ـ ٥ : دابەشکردنی دیالێکتەکانی زمانی کوردی**

دابەشکردنی دیالێکتەکانی زمانی کوردی لای شارەزا و پسپۆڕانی کورد و غەیرە کورد لە کۆنەوە تاکو بە ئەمڕۆ دەگات، بە چەندین شێواز و جۆری جیاجیاوە دابەش کراوە، بۆیە لێرەدا هەندێ لەو دابەشکردنانە دەخەینەڕوو:

شەرەفخانی بەدلیسی لە کتێبی (شەرفنامە)[1]دا، بەمشێوەیەی خوارەوە دیالێکتەکانی زمانی کوردی دابەشکردووە:

**١ـ کرمانج**

**٢ـ لوڕ**

**٣ـ کەلهوڕ**

**٤ـ گۆران**

محەمەد مەردۆخی لە کتێبی (مێژووی کورد و کوردستان)[2]دا، دیالێکتەکانی زمانی کوردی بەمشێوەیە دابەشکردووە:

**١ـ کرمانج**

**٢ـ گۆران**

**٣ـ لوڕ**

**٤ـ کەلهوڕ**

محەمەد ئەمین زەکی لە کتێبی (خلاصە تاریخ الکرد و کردستان من اقدم العصور التاریخیە حتی الان)[1]دا، دیالێکتەکانی زمانی کوردی بەمشێوەیە دابەشکردووە:

---

1- میر شەرەفخانی بدلیسی(٢٠٠٦)، شەرەفنامە ـ مێژووی ماڵە میرانی کوردستان، و: مامۆستا هەژار، چاپی سێیەم، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، هەولێر، ل ٢١.

2- محەمەد مەردۆخی(١٩٩١)، مێژووی کورد و کوردستان، عەبدولکەریم محەمەد سەعید، چاپی یەکەم، چاپخانەی (اسعد)، بەغدا، ل ٨٤.

**١ـ کرمانجی ڕۆژهەلات**

**٢ـ کرمانجی ڕۆژئاوا**

**٣ـ کرمانجی باشووری ڕۆژئاوا**

شێخ محەمەدی خاڵ لە فەرهەنگی (خاڵ)[2]دا، بەم شێوەیەی خوارەوە دیالێکتەکانی زمانی دابەشکردووە:

**١ـ زازا**

**٢ـ کرمانجی دەستە چەپ(شمالیی): (بۆتانی، بادینی،هەکاری، بایەزیدی، شەمدینانی).**

**٣ـ کرمانجی دەستەڕاست:(سۆرانی،بابانی،موکریانی،ئەردەلانی ، کەلهوڕی، گۆران).**

**٤ـ لوڕی (بەختیاری، لەکیی، فەیلی).**

تۆفیق وەهبی، بەمشێوەیە دیالێکتەکانی زمانی کوردی دابەشکردووە[3]:

**١ـ کرمانجی**

**أـ کرمانجی ژووروو:(بۆتانی، ئاشیتایی، هەکاری،بادینانی، بایەزیدی).**

**ب ـ کرمانجی خواروو:(موکری،مەهابادی،سۆرانی،سولەیمانی، سنەیی).**

**٢ـ لووڕی:(بەختیاری، لەکی، فەیلی،کەلهوڕی،مامەسەنی).**

**٣ـ گۆران: (باجەلانی، کاکەیی، زەنگەنە، هەورامی).**

**٤ـ زازا.**

---

[1]- محمد امین زکی (١٩٦١)، خلاصة تاريخ الكرد و كردستان من اقدم العصور التاريخية حتى الان، محمد علی عونی، الجزء الاول الطبعة الثانية، بغداد، ص ٣١٦.

[2]- محمدی خاڵ(١٣٦٧)(١٩٨٨)، فەرهەنگی خاڵ، جزمی یەکەم، کتابفرۆشی محمدی سەقزی، چاپ اول، ل ٢٦.

[3]- زبیر بلال اسماعیل(١٩٨٤)، مێژووی زمانی کوردی، و: یوسف ڕەئوف عەلی، چاپخانەی (دار الحریە للطباعة)، بەغدا، ل ١١٥ – ١١٦.

فوئاد حەمە خورشید لە کتێبی (زمانی کوردی ـ دابەشبوونی جوگرافیای دیالێکتەکانی)[1] بەمشێوەیە دیالێکتەکانی زمانی کوردی دابەشکردووە:

**١ـ کرمانجی باکوور:(بایەزیدی، هەکاری، بۆتانی، شەمدینانی، بادینانی، دیالێکتی ڕۆژئاوا).**

**٢ـ کرمانجی ناوەڕاست:(موکری، سۆرانی، ئەردەلانی، سلێمانی، گەرمیانی).**

**٣ـ کرمانجی باشوور:(لوڕی ڕەسەن، بەختیاری، مامەسەنی، کۆهگلۆ، لەك، کەلهوڕ).**

**٤ـ گۆران: (گۆرانی ڕەسەن، هەورامانی، باجەلانی، زازا).**

زوبێر بیلال لە کتێبی (مێژووی زمانی کوردی)[2]دا، بەمشێوەیە دیالێکتەکانی زمانی کوردی دابەشکردووە:

**١ـ کۆمەڵی ژووروو (کرمانجی)**

**٢ـ کۆمەڵی خواروو (سۆرانی)**

جەمال نەبەز لە کتێبی (زمانی یەکگرتووی کوردی)[3]دا، بەمشێوەیە دیالێکتەکانی زمانی کوردی دابەشکردووە:

**أ ـ دوو شێوە بنچینەییەکە:**

**١ـ کرمانجی ژووروو:(بۆتانی، جزیرەیی، هەکاری، بادینانی، ئاشیتەیی، بایەزیدی).**

**٢ـ کرمانجی نێوەڕاست:(سلێمانی، سنەیی، ئەردەلانی، گەرمیانی، هەولێر، کەرکووکی، سۆرانی، موکری، شاربازێڕی، پشدەری).**

---

[1]- فوئاد حەمە خورشید(١٩٨٥)، زمانی کوردی ـ دابەشبوونی جوگرافیایی دیالێکتەکانی، و: حەمە کەریم هەورامی، چاپخانەی (افاق العربیة)، بەغدا، ل ٤٠.

[2]- زبیر بیلال اسماعیل (١٩٨٤)، مێژووی زمانی کوردی، ل ١١٦ — ١١٧.

[3]- جەمال نەبەز (١٩٧٦)، زمانی یەکگرتووی کوردی، یەکێتی نەتەوەیی خوێندکارانی کورد لە ئەورووپا بلاوی کردۆتەوە، بامبێرگ ـ ئەڵمانیای ڕۆژئاوا، ل ٢٢ — ٢٣.

**ب ـ دوو شێوە لاتەنیشتەکە:**

**١ـ کرمانجی خواروو: (ژێروو): (فەیلی، کرماشانی، لەکی، کەلهوڕی، خانەقینی، لوڕی).**

**٢ـ کۆمەڵە شێوەی گۆرانی ـ زازایی (گۆران، زازایی، هەورامانی).**

عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ لە کتێبەکانی (سەرنجێ لە زمانی ئەدەبیی یەکگرتووی کوردی)[١] و (بۆ زمان)دا[٢]، زمانی کوردی بەمشێوەیە دابەشکردووە:

**١ـ لووڕ.**

**٢ـ کرمانجی ژوور: (بۆتانی، هەکاری، بادینانی، بایەزیدی، ئاشیتایی).**

**٣ـ گۆران: (هەورامی).**

**٤ـ کرمانجی خواروو:(سۆرانی، سلێمانی، موکری، گەرمیانی).**

تاهیر سادق لە کتێبی (ڕێنووس ـ چۆنیەتی نووسینی کوردی)[٣]، دیالێکتەکانی زمانی کوردی بەمشێوەیە خستۆتەڕوو:

**١ـ زازا**

**٢ـ لوڕی (بەختیاری، لەکیی، فەیلی، ڕۆژبەیانی).**

**٣ـ کرمانجی:**

**أـ کرمانجی سەروو:(بۆتانی، بادینانی، هەکاری، بایەزیدی، شەمدینانی).**

**ب ـ کرمانجی خواروو: (سۆرانی، موکریانی، ئەردەڵانی، کەلهوڕی، گۆرانی).**

---

[١]- عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ(د)(١٩٧١)، سەرنجێ لە زمانی ئەدەبیی یەکگرتووی کوردی، چاپی یەکەم، چاپخانەی (سلمان الاعظمي)، بەغدا، ل ١٤ — ١٩.

[2]- عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ(د)(٢٠٠٥)، بۆ زمان، بەڕێوەبەرێتی گشتی چاپ و بڵاوکردنەوە، چاپخانەی شڤان، سلێمانی، ل ٩٦ — ١٠١.

[٣]- طاهر صادق (١٩٦٩)، ڕێنووس ـ چۆنیەتی نووسینی کوردی، چاپی یەکەم، چاپخانەی شیمال، کەرکووك، ل ٩٢.

کەمال فوئاد لە وتاری (زاراوەکانی زمانی کوردی و زمانی ئەدەبی و نووسینیان)[1]دا، دیالێکتەکانی زمانی کوردی بەمشێوەیە خستۆتەڕوو:

**١- کرمانجی سەروو**

**٢- کرمانجی خواروو**

**٣- کوردی باشوور**

**٤- گۆران و زازا**

محەمەد ئەمین هەورامانی لە کتێبی (زاری زمانی کوردی لە تەرازووی بەراوردا)[2]، دیالێکتەکانی زمانی کوردی بەمشێوەیە دابەشکردووە:

**١- شێوەی کرمانجی سەروو یا ژووروو (بۆتانی، هەکاری، دیاربەکری، بادینانی، ماردین،... هتد).**

**٢- شێوەی کرمانجی ناوەڕاست:(سۆرانی، موکریانی، سلێمانی، کەرکووکی).**

**٣- شێوەی کرمانجی خواروو:(هەورامان، لوڕی، باجەڵانی، زازای).**

وەکو دەردەکەوێت ئەم دابەشکردنانە زۆربەیان لەسەر بنەمایەکی زانستیی دانەنراون، هەروەها لێکۆڵەران زیاتر لە ناوێکیان بۆ دیالێکتەکان بەکارهێناوە و بە تەواوەتی سنووری جوگرافیی دیالێکتەکانیان دیاری نەکردووە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دابەشکرنەکانی تۆفیق وەهبی و فوئاد حەمە خورشید لە ڕووی زانستییەوە نزیکن و دەکرێت پشتییان پێببەسترێت.

---

[1]- کەمال فوئاد(د)(١٩٧١)، زاراوەکانی زمانی کوردی و زمانی ئەدەبی و نووسینیان، گ. زانیاری، ژ (٤)، بەغدا، ل ٢٢ — ٢٤.

[2]- محەمەد ئەمین هەورامانی (١٩٨١)، زاری زمانی کوردی لە ترازووی بەراوردا، چاپی یەکەم، بەغدا، ل ٦٨ — ٧٠.

# سنوور و نەخشەی دیالێکتەکانی زمانی کوردی

## یەکەم: دیالێکتی کرمانجی سەروو (باکوور)

ئەم دیالێکتە لە هەموو دیالێکتەکانی تری زمانی کوردی فراوانترەو زۆرترە، چونکە کوردەکانی کوردستانی تورکیا (پارێزگاکانی بایەزیدی، وان، جۆلە مێرگ، سیعرت، مووش، ماردین، دیاربەکر، خەرپوت، ئەدیابان، غازیان تەپە، بەشەکانی خۆرهەلاتی پارێزگای مەرعەش و سیواس و بەشەکانی باشووری پارێزگای ئەرزەرۆم و قارس)، هەموو بەم دیالێکتە دەدوێن، هەروەها کوردەکانی باشووری خۆرئاوای ئەرمەنستان، ڕووسیا و باکووری سوریا و دانیشتوانی پارێزگای دهۆك و قەزاکانی زێبار و ئامێدی و شێخان و سنجار و ئاکرێ لە کوردستانی عێراق و کوردەکانی ئورمییە و سەلماس و ناوچەکانی تری شکاك بەم دیالێکتە دەدوێن.

ئەم دیالێکتە لقە دیالێکتەکانی بەمشێوەیەی خوارەوەن:

١ـ بایەزیدی: دەکەونە باکوورو باکووری خۆرهەلاتی زەریاچەی وان.

٢ـ هەکاری: دەکەونە باشوور و باشووری خۆرئاوای زەریاچەی وان.

٣ـ بۆتانی: دەکەونە دەوروبەری دۆلی بۆتان و شاری سیعرت و ئەرتوش و جزیرەو دیاربەکر (ئامەد).

٤ـ شەمدینانی: گۆشەکەی باشووری خۆرهەلاتی تورکیا و خۆرهەلاتی زێی ژووروو و ناوچەکانی نزیك بەم زێیەیە لە ئێران.

٥ـ بادینانی: پارێزگای دهۆك و قەزاکانی ئامێدی و زێبار و سنجار و شێخان و ئاکرێ دەگرێتەخۆ.

٦ـ بەشە شێوەزاری خۆرئاوا: خەرپووت و ئۆرفە و عەفرین و مەرعەش و قامیشلو و حەلەب دەگرێتەوە.

٧ـ شکاك: کوردەکانی سەلماس و خوێی و ئورمییە دەگرێتەوە.

## دووەم: دیالێکتی کرمانجی ناوەڕاست

ئەم دیالێکتە پێنج شێوەزاری ناوچەیی دەگرێتەخۆ:

١ـ موکری: مەڵبەندەکانی شنۆ، نەغەدە، مەراغە، میاندواو، شاهێن دژ، سەقز، بۆکان، بانە و سەردەشت دەگرێتەوە.

٢ـ سۆرانی: قەزای زێباری لێ دەرچێ، هەموو پارێزگای هەولێر دەگرێتەوە، شاری هەولێر ناوجەرگەی ئەم شێوەزارەیە.

٣ـ ئەردەڵانی: مەڵبەندەکانی سنە، بیجار، کەنگەوەر، ڕەوانسەر، باکووری ناوچەکانی جوانرۆ لە کوردستانی ئێران، لە کوردستانی عێراقیش قەزای قەڵادزێ(پشدەر) دەگرێتەوە. شاری سنە ناوجەرگەی ئەم شێوەزارەیە.

٤ـ سلێمانی: شاری سلێمانی ناوجەرگەیەتی، هەموو پارێزگاکە جگە لە قەزای قەڵادزێ (پشدەر) نەبێت دەگرێتەوە، هەروەها هەندێ ناوچەی قەزای خانەقینیش دەگرێتەوە.

٥ـ گەرمیان: ئەم شێوەزارە، جیاوازییەکی ئەوتۆی لەگەڵ سلێمانی نییە، لەگەڵ ئەوەشدا بەشێوەزارێك دادەنرێت، بەهۆیەوە هەموو ناوچەکانی کفری و قەرەتەپە و کەرکووك و دووزخورماتوو و شوان لە کوردستانی عێراق دەگرێتەوە.

**سێیەم: دیالێکتی کرمانجی باشوور (خواروو)**

ئەم دیالێکتە چەند شێوەزارێك دەگرێتەوە:

١ـ لەکی: ئەم شێوەزارە، کوردەکانی (پێش کۆ)ی لورستانی پێ دەدوێن، تیرەکانیشی بریتین لە (خواجەوەند، عەبدولمالیکی، ناداوەند، شۆجا، کاتاوەند، دەلفان، سەلسەلە، پیران وەند).

٢ـ بەختیاری: بەختیاری دوو بەشن، (هەفت لنگ)، واتا (حەوت هۆز)، کە لە ناوچەکانی ئاوەلێژی ڕووباری گارۆندا دەژین.(چوارلنگ)، واتا (چوار هۆز)، لە ناوچەی نێوان ڕووباری گارۆن و ڕووباری زالکیدا نیشتەجێن.

٣ـ مامەسەنی: ناوی ئەم شێوەزارە لە (محەمەد حەسەن)ی باپیرە گەورە مامەسەنیانەوە وەرگیراوە، کە بریتین لە (بەکشی، جاوی، ڕوستەمی (خان عەلی خان، ئیمام قولی خان) دەگرێتەوە.

٤ـ کۆهگلۆ: ئەم لقە لە باشووری ناوچەکانی بەختیارییەوە و لە دەوروبەری کێوی دنیا و چاوگەکانی ڕووباری چەراهییەوە دەست پێ دەکات تا ڕامهورموز و بەهبەهان و کزەیرون، دوو کۆمەڵەن:

أ ـ کۆمەڵەی پشتی کۆ

ب ـ کۆمەڵەی ژێرکۆ

**٤ـ دیالێکتی گۆران**

ئەم دیالێکتە لە باکووری ڕێگەی نێوان قەسری شیرین ـ کرمانشاه دەست پێ دەکات، بەرەو شاخەکانی هەورامان، هەروەها لەسەرچاوەکانی سیراوەنەوە بەرەو خۆرهەلات دانیپۆشیوە تا کرماشان. ئەم دیالێکتە پێك دێت لە:

١- گۆرانی ڕەسەن: کە دانیشتوانی ناوچەکانی (کرند، زەهاو، جوانڕۆ) لە کوردستانی ئێران قسەی پێ دەکەن، هەروەها لە کوردستانی عێراق، هەندێ کاکەیی داقوق و تیرەی زەنگەنەی نزیك کفری و قادرکەرەم و سیامەنسوری سەر بە ناوچەی لەیلان قسەی پێ دەکەن.

٢- هەورامان: دانیشتوانەکانی شاخەکانی هەورامان و پاوە و پڵنگان دەگرێتەوە، هەورامیش دوو بەشن، بەشی لهۆنیان لە خۆرئاوای ڕیزە شاخەکانی هەورامان، واتە دەکەوێتە کوردستانی عێراق، بەشی دووەمیان، هەورامانی (تەخت) کە دەکەوێتە خۆرهەڵاتی شاخەکانی هەورامان، واتە دەکەوێتە کوردستانی ئێران.

٣- باجەڵانی: ئەم شێوەزارە پەرش و بڵاون، هەندێکیان لە باکووری خۆرهەڵاتی شاری مووسڵ نیشتەجێن، کە پێیان دەوترێ (شەبەك)، بەشێکیشیان لە زەهاو و لە باکووری لوڕستان و نزیك خانەقین و قۆرەتوو هۆرین و شێخان.

٤- زازا: ئەم لقە دیالێکتە ناوچەکەی دەکەوێتە کوردستانی باکوور، کە کەوتۆتە ناوچەی نێوان ئەرزەرۆم - موش - خەرپووت و ئەرزنجان دەگرێتەوە، کەواتە ئەمانە دەکەونە ناوچەی دەرسیمەوە.

### ٦-٢ : جیاوازی نێوان زمان و دیالێکت

کۆزمانەوانەکان تاکو ئێستا نەگەیشتوونەتە بڕیارێکی ڕەها و پێوەرێکی ڕاست و دروست لەبارەی سنووری جیاکردنەوەی نێوان زمان و دیالێکت، بەجۆرێك هەندێ لە کۆزمانەوانەکان سێ بنەمایان بۆ جیاکردنەوەکە دەست نیشان کردووە، ئەوانیش بریتین لە (بنەمای لەیەکتر گەیشتن، بنەمای قەبارە، بنەمای ناودار)[1]، بەلاّم هەر سێ بنەماکە لە کەموکووڕی بەدەر نییە. هەندێکی تر جیاوازییەکان لە چەند ڕوانگەیەکی ترەوە سەیر دەکەن، لەوانە (بەستاندەربوون، جوگرافی، کۆمەلاّیەتی، بەکارهێنان، مێژوویی، سیمانتیکی و لێکتێگەیشتن)[2]، بەلاّم ئەمەشیان سنوورێکی تەواوی جیاکردنەوەی نێوان زمان و دیالێکت ناکێشێت.

کەواتە جیاوازییەکانی نێوان زمان و دیالێکت ڕێژەیین، بە واتایەکی دی سنوورێکی ڕەها و سەداسەدی جیاکەرەوەی نێوان زمان و دیالێکت لە ئارادا نییە، بۆیە جیاوازییەکانیان لەم خالاّنەی خوارەوە دەست نیشان بکەین[3]:

١ـ زمان لایەنێکی گشتی و سنوورێکی جوگرافی فراوان دەگرێتەوە، بەهۆیەوە بەهەموو لایەکی ولاّتدا پەلدەکێشێ، تاڕادەیەکیش هەموو دیالێکتەکان کۆدەکاتەوە، بەلاّم دیالێکت ناوچەیەکی سنووری جوگرافی دیاریکراو دەگرێتەوە، واتە لایەنێکی تایبەتییە.

---

1- قەیس کاکل تۆفیق(د)(٢٠٠٧)، ئاسایشی نەتەوەیی و پلانی زمان، لە بلاّوکراوەکانی دەزگای توێژینەوە و بلاّوکردنەوەی موکریانی، چاپخانەی دەزگای ئاراس، هەولێر، ل ٦٣ — ٦٤.

2- عەبدولمەناف ڕەمەزان ئەحمەد (٢٠٠٩)، ئەتلەسی زمانی ـ هەرێمی کوردستان عێراق وەك نموونە، نامەی ماستەر، بەشی کوردی کۆلێژی زمانی زانکۆی سەلاحەدین، ل ٣٠ — ٣٣.

3- سەلام ناوخۆش و نەریمان خۆشناو (٢٠٠٩)، کوردۆلۆجی، ل ٧٤ — ٧٥.

٢- زمان كۆی هەموو ئەو جیاوازییانە دەگرێتەوە، كە لەنێوان دیالێكتەكانی زمانەكەدا هەن، بەڵام دیالێكت لەسەر بنەمای ئەو جیاوازییانە دروست دەبێت، كە لەناو زماندا هەیە، بۆیە جیاوازییەكی زۆریان لەسەر ئەم ڕێككەوتنە هەیە.

٣- زمان پەیوەستە بە بنەمای لەیەكتر نەگەیشتن، بەڵام دیالێكت پەیوەستە بە بنەمای لەیەكتر گەیشتن، واتە ئەگەر قسەكەرانی دوو دیالێكت لەیەكتر گەیشتن، ئەوا ئەو دوو دیالێكتە، زمانێك پێكدەهێنن، بەڵام ئەگەر قسەكەرانی دیالێكتەكان لەیەكتر نەگەیشتن، ئەوا هەریەك لەمانە بەرەو ئاراستەیەكی زمانی سەربەخۆ دەڕۆن.[1]

٤- بەشێوەیەكی گشتی زمان بۆ ئەم جۆرانە دابەش دەكرێت: (زمانی نووسراو، زمانی بینراو، زمانی جەستە، زمانی ڕەنگ، زمانی ڕووخسار، زمانی دەق، زمانی شیعریی، زمانی ئاخاوتن، زمانی یەكەم، زمانی دووەم، زمانی سەرچاوە،...هتد)، بەڵام دیالێكت ئەم جۆرە دابەشكردنانەی نییە، بەڵكو دیالێكت ئەمجۆرانە دەگرێتەوە:(دیالێكتی پەتی، دیالێكتی ستاندارد، دیالێكتی جوگرافی، دیالێكتی فەرمی، دیالێكتی ڕەمەكی، دیالێكتی كۆمەڵایەتی، دیالێكتی پیشەیی،...هتد).

٥- زمان بەپێی ڕەگەزی ئەندامانی كۆمەڵ ناگۆڕێت، بەڵام دیالێكت بەپێی ڕەگەز و جوگرافیا و دابەشبوونی چینەكانی كۆمەڵگە دابەش دەبێ.

٦- زمان لەلایەن تێكڕای دانیشتوانەوە بەكاردەهێنرێت، بەڵام دیالێكت لەلایەن بەشێكی دیاریكراوی دانیشتوانەوە بەكاردەهێنرێت[2].

---

[1]- وریا عومەر ئەمین(١٩٨٥)، چەن زمان، ڕ.(العراق)، ژ.(٢٧٣١)، ١٩٨٥/١/٢٣، ل٤.

[2]- غازی عەلی خورشید (٢٠١٠)، زمان و زمانی ستاندارد بۆ كورد، بەشی یەكەم، ڕ. ئاسۆ، ژ (١٥٢٨)، سێشەممە ٢٠١١/٧/٩، ل ١٤.

٧ـ زمان ڕێنووسی ستاندارد و ڕێزمانی هەیە و لە فێرگە و دامەزراوەکان و میدیاکان... هتد بەکاردێت، بەڵام دیالێکت مەرج نییە لە فێرگە و دامەزراوەکاندا بەکاربێت[١].

٨- زمان بەرهەمێکی دەستکرد و پلان بۆ داڕێژراوە، بەڵام دیالێکت بەرهەمێکی سروشتی ناوچەیەکی دیاریکراوە[٢].

٩- هەندێکی دی پێکهاتی زمانیی وەك جیاوازی ڕێزمان دەکەن بە پێوەر، واتە ئەگەر پێکهاتە زمانییەکە لەیەك نزیك بوو یان وەك یەك بوو، ئەوە دوو دیالێکتی زمانێکە، ئەگەر لە یەك دوور بوون، ئەوە دوو زمانن.[٣]

[1]- غازی عەلی خورشید(٢٠١٢)، زمانی فەرمی بۆ کوردستان، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی، ل ٢٩.

[2]- هەمان سەرچاوە، ل ٢٩.

[3] - سوداد ڕەسوڵ(٢٠١٢)، هەورامی لەهجەیە یان زمان؟ ، گ. زمانناسی، ژ. (١٣)، ٢٠١٢، ل١٠.

# بەشی سێیەم
# زمانی ستاندارد

## ٣ ـ ١: پێناسەی زمانی ستاندارد

پێش ئەوەی پێناسەی زمانی ستاندارد بکەین، پێویستە چەند زاراوەیەکی وەك ( زمانی ئەدەبی، زمانی ئەدەبی یەکگرتوو، زمانی نیشتمانی، زمانی فەرمی (کارگێڕیی)، زمانی نەتەوە، زمانی هاوبەش،.... هتد) لە یەکتر جیابکەینەوە، چونکە زۆر جار تێکەڵی یەکتر دەکرێن یاخود بە هاوواتای یەکتر دادەنرێن، لەبەرئەوەی ئەمە هەموو کاتێك و لە هەموو شوێنێکدا ڕاست نییە.

زمانی ئەدەبی، ئەو شێوە زمانەیە، کە پێی دەنووسرێت یاخود ئەدەبی پێدەنووسرێتەوە، بەلاّم لە یەکێك لە دیالێکتەکان یان یەکێك لە شێوەزارەکانی دیالێکتێك و لە ڕووبەرێکی دیاریکراوی جوگرافیای زمانەکەدا ڕەچاو دەکرێت و نەگەیشتۆتە ئاستێکی وەها، کە سەرجەم نەتەوەی خاوەن زمان بەکاری بهێنن[١]. بە نموونە شیعرەکانی باباتاهیری هەمەدانی (٩٣٥ — ١٠١٠)، کە بە دیالێکتی کرمانجی خواروو (لوڕی) نووسراون، لە ڕۆژگارێکدا ئەم دیالێکتە زمانی ئەدەبی بووە، بەلاّم دوایی پەرەی نەسەندووە و بەرهەمیشی بە دوایدا نەبووە[٢].

زمانی ئەدەبی یەکگرتوو، ئەو زمانەیە، کە بناغەکەی لە یەکێك لە دیالێکتەکانەوە وەردەگیرێت و زۆرجار پوختەکراوێکی زمانی یەکگرتووەکەیە یا

---

[1]- هۆگر مەحموود فەرەج(٢٠٠٧)، زمان و نەتەوە و زمانی ئەدەبیی یەکگرتوو، کۆنگرەی دووەمی زانستی زمان ـ لە پێناو پەرەپێدان و چەسپاندنی زمانی کوردی، گۆڤاری ژمارە (٢)، ٢٠/٥/٢٠٠٧، ل ١٢٤ — ١٢٥.

[2]- هەمان سەرچاوە، ل ٢١٥.

دیالێکتێکی پەتی یان بلێین پوختەکراوێکی زمانی قسەکردنە[1]. یان بەو شێوە زمانە دەوترێت کە پێی دەنووسرێت و زمانی فەرمی نەتەوەیەك یان ولاتێکە، کە ئەگەرچی خۆی لە بنەچەدا لە گۆڤەرێکدا بەکاردێت، بەلام پەرەی سەندووە و لە سنووری دیالێکتەکە پەڕیوەتەوە و چۆتە نێو دیالێکتەکانی تری زمانەکە و بووەتە زمانی قسەپێکەرانی ئەو گۆڤەر و دیالێکتانە[2]. بە نموونە شێوەزاری سلێمانی لە دیالێکتی کرمانجی ناوەڕاست لە سنوورێکی فراواندا بلاوبۆتەوە، کە جگە لە نووسەرانی گۆڤەرەکە خۆی، بەلکو نووسەرانی سەر بە دیالێکتی گۆران و لوڕ و هەندێ لە نووسەرانی گۆڤەری بادینان، بەو شێوەزارە دەنووسن و بۆتە زمانی ئەدەبی یەکگرتووی کوردی[3].

زمانی نیشتمانی، جۆرە زمانێکە کە لە ولاتدا ڕێگە پێدراوە و بەکاردەهێنرێت، بە نموونە زمانی نیشتمانی هاوولاتیانی ولاتێك کە تەنیا زمانێك بەکاردەهێنن، وەکو زمانی ئەلمانی لە ئەلمانیا و زمانی ئینگلیزی لە ئەمەریکا و بەریتانیا و ئوسترالیا[4].

واتە لەم ولاتانەدا (زمانی نیشتمانی، زمانی نەتەوە، زمانی فەرمی) هاوواتای یەکترن، بەلام ئەو ولاتانەی کە فرەزمان و فرەنەتەوەن، وەك بەلجیکا و سویسرا هاوواتای یەکترنین، لە ولاتانی وەك تورکیا، ئێران، سوریا (کە سەبارەت بە کورد ولاتی داگیرکارن)، زمانی نەتەوەی بالادەست لەو ولاتانە بە زمانی فەرمی، نیشتمانی

---

[1]- عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ(د)(١٩٧١)، سەرنجێ لە زمانی ئەدەبی یەکگرتووی کوردی، چاپخانەی (سلمان الاعظمي)، بەغدا، ل ١٢.

[2]- هۆگر مەحموود فەرەج(د)(٢٠٠٧)، هەمان سەرچاوە، ل ٢١٦.

[3]- سەرچاوەی پێشوو، ل ٢١٦ – ٢١٧.

[4]- طارق جامباز(٢٠٠٧)، یاسای زمانە فەرمییەکان لە چەند ولاتێکی فرەزماندا، و: مەجید ئاسنگەر، لە بلاوکراوەکانی ئەنجوومەنی نیشتمانی کوردستانی عێراق، چاپخانەی شەهاب، هەولێر، ل ٣.

هەتا ستانداردیش دادەنرێت[1]، لەبەر ئەوەی نەتەوەی کورد نیشتمانیان دابەشکراوە و زمانەکەشیان لە ژێر کاریگەری زمانی نەتەوە بالادەستەکاندا دەناڵێنێ[2].

زمانی فەرمی یان ڕەسمی، کە بە زمانی کارگێڕیی ناودەبرێت، ئەو زمانەیە، کە وێنە و ناسنامەیەکی یاسایی بە وڵاتێك، یان حکومەتێکی هەرێمیی دەبەخشێ، ئەم جۆرە زمانە لە کۆمەڵگای تاکزمانیدا زمانی نەتەوەییە، و لە کۆمەڵگای جووتزمانی و فرەزمانیدا زمانێکی نیشتمانییە، و لە پەرلەمان و دادگا و خوێندندا بەکاردێ، و لە زۆربەی ڕووەکاندا لەگەڵ زمانی ستانداردا یەکدەگرێتەوە[3].

یاخود زمانی فەرمی ئەو زمانەیە کە لەلایەن زمانبەکارهێنەرانێك لەسەر سەکۆیەك دێتە بەکارهێنان، کە لەوێدا ئاڵوگۆڕی زانیاریی و خستنەڕووی بۆچوونی جیاوازی دەربارەی بابەتێك دەخرێتە بەرچاو، کە جێگەی بایەخی گشتە .[4]

بۆ نموونە لە سویسرا چوار زمانی فەرمی هەیە و لە بەلجیکا سێ زمانی فەرمی و لە کەنەدا دوو زمانی فەرمی، لەم وڵاتانەدا زمانی فەرمی و ستاندارد یەکن، بەڵام لە هیندستان (٢٢) زمانی فەرمی هەیە[5]، کەچی (٢) زمانی ستاندارد هەیە، ئەوانیش ئینگلیزی و ئۆردووە.

زمانی نەتەوە یا زمانی نەتەوەیی، ئەو زارە یان زمانەیە، کە لە سنووری وڵاتێکدا بەکاردێت، بۆ ئەنجامدانی سێ ئەرکە گەورەکەی زمان لە هەموو بوارەکانی ژیاندا،

---

[1]- سەلام ناوخۆش و نەریمان خۆشناو(٢٠١٠) کوردۆلۆجی، ل ٨٢.

[2]- طارق جامباز(٢٠٠٧)، هەمان سەرچاوە، ل ٤.

[3]- سەلام ناوخۆش(٢٠١٠)، ستاندەربوونی زمانی کوردی لە نێوان زمانی سیاسەت و سیاسەتی زمان، لە بڵاوکراوەکانی ڕێکخراوی زمانناسی، چاپخانەی منارە، هەولێر، ل ٢٤ — ٢٥.

[4]- غازی عەلی خورشید(٢٠١٢)، زمانی فەرمی بۆ کوردستان، ل ٣٣.

[5]- طارق جامباز(٢٠٠٧)، هەمان سەرچاوە، ل ٤.

مەبەست لە بوارەکانی قوتابخانە و دادگا و شەقام و ماڵ و مزگەوت و فەرمانگەکانە، سێ مەبەستە گەورەکەش بریتین لە:-

١ـ بەڕێوەبردنی کاروباری ئیداریی و پەروەردەیی و تەندروستی و کۆمەڵایەتی (ئامانجی ئیداریی).

٢ـ گەشەپێکردنی کەلتووری هاوبەش، کە خەڵکی کۆدەکاتەوە.

٣ـ پتەوکردنی گیانی نیشتمانی و نەتەوەیی و هەستی هاوڵاتییەتی بۆ گرێدانی خەڵك بە یەکترەوە[1]. بە نموونە زمانی نەتەوەیی کورد، زمانی کوردییە و، زمانی نەتەوەیی عەرەب، زمانی عەرەبییە و، زمانی نەتەوەیی فارس، زمانی فارسییە.

چەمکی زمانی نەتەوە لەگەڵ ڕێنسانسی ئەورووپی لە ئەورووپا بڵاوبۆوە، بەڵام لەناو کورددا ئەو زمانە بەر لە ڕێنسانسی ئەورووپی لەلای شاعیرێکی وەك (ئەحمەدی خانی) نەك هەر ئەدەبی پێ نووسرا، بەڵکو وەك چەمکێکی نەوەیی کاری لەسەر کراوە، ئەحمەدی خانی بە زمانی نەتەوەکەی داستانێکی نەتەوەیی نووسیوە، بۆ ئەوەی میرانی کورد و تاکەکانی نەتەوەکەی لە هەڕەشەی گەلانی هاوسێی کورد وشیار بکاتەوە، بە جۆرێك زمانی کوردی لەلای ئەحمەدی خانی زمان و ناسنامەی نەتەوەیی کوردە، ئەو ڕەوتە (داکۆکیکردن لەسەر زمانی نەتەوە) لەلای (حاجی قادری کۆیی) زیاتر پەرەی پێدرا، بەجۆرێ ئەو زمانە بە شەرەفی کۆمەڵایەتی سیاسی نەتەوەش دانرا[2].

زمانی هاوبەش، تێکەڵەیەکە لە زمانێکی چێکراو بۆ پێوەندی ئەو نەتەوە و کۆمەڵانە بەکاردەهێنرێت، کە زمانێکی ستانداردیان نییە، یان کۆمەڵێ دیالێکتی

---

1- محمد معروف فتاح(د)(١٩٩٦)، زمانی نەتەوایەتی ـ چەند سەرنجێك، گ. مەتین، ژ. (٥٣)، ل ٢٢.

2- سەلام ناوخۆش و نەریمان خۆشناو(٢٠١٠)، کوردۆلۆجی، ل ٨٣.

ئەوەندە دووریان هەیە، پێویستیان بە زمانێکی ستانداردە، کە کۆیان بکاتەوە، ئەمجۆرە زمانە لینگوا ـ فرانکا (Lingua – Franca)ی پێ دەوترێت[1].

وەك هیندستان بەبێ هەبوونی نەتەوەیەکی وەك ئینگلیز لە ولاتەکەیاندا، زمانی ئینگلیزی هاوشانی زمانی هیندی، زمانی فەرمییە[2]، واتە لێرەدا زمانی ئینگلیزی وەك لینگوا فرانکا بۆتە زمانی هاوبەشی خەڵکی هیندستان. کەواتە لینگوا فرانکا یان زمانی هاوبەش زاراوەیەکە لە بواری زمانناسی کۆمەڵایەتی بەکاردێ، بوونی زمانی هاوبەش لە کۆمەڵگایەکی فرەزمانی و باڵادەست بوونی ئەو زمانە لە هەندێ بواری کۆمەڵایەتیدا بۆ خودی زمانەکە دەگەڕێتەوە، هەروەها ڕازیبوونی بەشی هەرە زۆری کۆمەڵگا لەسەر زمانەکە، بە واتایەکی تر ئەدگار و شەنگستەکانی زمانەکە لەلایەك و لەلایەکی تریشەوە بوونی خۆی بەسەر زمان و دیالێکتەکانی دەوروبەرەکە دەسەپێنێ، هەروەها فاکتەری سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئایینیش ڕۆڵی خۆیان دەبینن لە فراژووبوونی و نەشونماکردنی ئەو زمانە[3].

کەواتە زمانی ستاندارد واتایەکی سادەی نییە، بەڵکو بەکارهێنانی جۆراوجۆری هەیە، هەر ئەو بەکارهێنانە جۆراوجۆرەی ستاندارد، بۆتە هۆی ئەوەی کە پێناسەی جۆراوجۆر لەخۆ بگرێت.

---

[1]- کامیار سابیر(٢٠٠٩)، لینگوا فرانکای کوردیی ـ زمانی ستاندەرد و فەرمی، چاپخانەی ڕەنج، سلێمانی، ل ٢٢.

[2]- سەلام ناوخۆش و نەریمان خۆشناو(٢٠١٠)، هەمان سەرچاوە، ل ٨٣.

[3]- سەلام ناوخۆش (٢٠٠٤)، زمانناسی و هەندێ بابەتی زمانناسیی کوردی، چاپخانەی ژین، سلێمانی، ل ١٠٠.

ڕای دەڵێت: ((زمانی ستاندارد هەر ئەو زمانەیە کە چەند بەشێك لە خەڵکی کۆمەڵگا، کە شایانی ئەوەن خەڵکانی تر لاسایی ئەوان بکەنەوە، بە کاری دەهێنن))[1].

هەروەها (گارڤین و ماتیۆ) لە بارەی زمانی ستانداردەوە دەڵێن: ((زمانی ستاندارد شێوەی تۆمارکراو و سەقامگیری زمانە، کە زۆربەی کۆمەڵگای زمانی ئەوەیان وەکو ڕێبەر و نموونەیەك پەسند کردووە و بە کاری دەهێنن))[2].

لێرەدا (گارڤین و ماتیۆ) زمانی ستاندارد بە بەشێکی سەرەکی زمانی ڕۆشنبیریی شار دادەنێن، هەروەها بۆ زمانی ستاندارد تایبەتمەندی دادەنێن، کە شێوەزاری ناوچەیی بەشداری ئەو تایبەتمەندییە ناکات[3].

لە ئینسکلۆپیدیای زمان و زمانناسیدا نووسراوە:((زمانی ستاندارد بە شێوەیەك پێناسە کراوە، کە خەڵکی خوێندەوار و ڕۆشنبیر و کەسانێك کە لە ڕووی کۆمەڵایەتی، ئابووری و سیاسیەوە بەتوانان، بەکاری دەهێنن))[4].

محەمەد مەعروف فەتتاح دەڵێت: ((ئەو شێوەیەیە کە بە هەموو هەنگاوەکانی یەکگرتندا تێپەڕیوە و خاوەنی دەستوور و فەرهەنگە و لە کارگێڕیدا بەکاردێ، بەڵام لە سەرتاپای ناوچەیەکی جوگرافیدا ڕەزامەندی خەڵکی وەرنەگرتووە))[5].

دەبێ ئەوەش بوترێت، کە (محەمەد مەعروف) زمانی یەکگرتووی بە بەرزتر داناوە لەچاو زمانی ستاندارد، بەو واتایەی زمان لە دوای زمانی ستانداردەوە دەگات

---

1- Ray, P. S.(1963), Language Standardization, The Hague, Muton, 1963, P. 133.

2- ناصر قلی سارلی ١٣٨٧ (٢٠٠٨)، زبان فارسی معیار، انتشارات هرمس، تهران، چاپ اول، ص ٣.

3- هەمان سەرچاوە، ل ٤٠.

4- سەرچاوەی پێشوو، ل ٤٠.

5- محەمەد مەعروف فەتاح(د)(٢٠٠٨)، زمانی ستاندەرد و زمانی یەکگرتووی کوردی، ل ٤.

بە زمانی یەکگرتوو، چونکە بەلای ئەو زمانی یەکگرتوو ئەو زمانەیە، کە بە هاوردن یان تێکەڵکردنی چەند دیالێکتێك یان بە سەپاندنی زمانێکی ستاندارد لە ناوچەیەکی جوگرافیدا بە دەستێوەردان یان نەخشەدانان بۆ زمان دێتە کایەوە[1].

پەروێز ناتل خانلری بەمجۆرە پێناسەی زمانی ستانداردی کردووە:((زمانی ستاندارد یەکێکە لە شێوەزارەکانی ئەو کۆمەڵگایە، کە بە حوکمی پێویستی بۆ هۆکاری پەیوەندی نێوان ئەو نەتەوانەی، کە بە شێوەیەك لێکچوونیان لە نێوان دایە و بۆ کاروباری ڕۆژانە کە لەنێوانیاندا هاوبەشە، بەکاری دەهێنن))[2].

لە فەرهەنگی دەستەواژەی زمانناسیدا هاتووە: ((زمانی ستاندارد، شێوەیەك لە زمانەکە لەلایەن کۆمەڵگاوە وەردەگیرێت (پەسند دەکرێت) و لەسەر بنەمای خوێندەواران جێگیربووە و لە بنکە سیاسی و فەرهەنگی بەکاربردرێت، ئەو شێوەیە وەکو زمانێکی یاریدەدەر و سەرەکی و زمانی نووسینی نێوان قسەپێکەرانی شێوەزارەکانی تر باوە و وەکو ئەوە وایە، کە زمانی بیانی فێری خەڵکی میللەتانی تر بکرێت))[3].

خەسرۆ فەرشیدورد دەڵێت: ((زمانی ڕۆشنبیری (فەرهەنگی) و ئەدەبی هاوبەشی خوێندەواران، پیاوە ئایینیەکان، سیاسەتمەداران، زانایان، ڕۆژنامەنووسان و نووسەرانی کتێبی مەنهەجی و زانستی و هونەرییە، کە بەکاری دەهێنن و پێی دەنووسن و مەبەستی خۆیانی پێ دەگەیەنن))[4].

---

[1]- هەمان سەرچاوە، ل ٤.

[2]- پرویز ناتل خانلری ١٣٧٣(١٩٩٤)؛ زبان شناسی و زبان فارسی، چاپ ششم، تهران، توس، ص ٨٤.

[3]- خسرو فرشیدورد ١٣٦٣(١٩٨٤)، دربارة ادبیات ونقد ادبی، جلد٢؛ تهران، امیر کبیر، ص٦١٠.

[4]- خسرو فرشیدورد ١٣٨٠(٢٠٠١)؛ لغت سازی و وضع وترجمة اصطلاحات علمی وفنی، تهران، سازمان تبلیغات اسلامی، حوزة هنری،ص ٥٦٤.

یەحیا مودەڕیسی بەمجۆرە پێناسەی زمانی ستاندارد دەکات:((زمانی ستاندارد شێوەیەکی پێشکەوتووی زمانێکە، کە زۆرتر لەلایەن قسەپێکەرانی خوێندەوارەوە، کە لە شوێنی فەرهەنگی و سیاسی یەك وڵات دەژین، بەکار دەهێنرێت. ئەو شێوە زمانە زۆرجار وەکو زمانی ڕەسمی لە پەروەردە، میدیاکان و ڕۆژنامەکان و... بەکاردەهێنرێت و، قسەپێکەرانی شێوە کۆمەڵایەتی و جوگرافیایی جۆراوجۆر تێدەکۆشن، بۆ ئەوەی لەو زمانە نزیك ببنەوە و لە حاڵەتی جۆراوجۆردا بەکاری بهێنن))[1].

سەلام ناوخۆش دەڵێت : زمانی ستاندارد زمانی ئاخاوتن نییە، چونکە زمانی دایك نییە! زمانێکە لە دامودەزگای خوێندن و فێرکردن و ڕاگەیاندن و دامودەزگای دی دەوڵەت هەیە، زمانێکە ئەدەبی باڵاو دەستووری وڵات و یاساکانی و دەقی ئایینی پێ دەنووسرێت، ئەم شێوازەی زمان لە قوتابخانە وەریدەگرێ یان فێری دەبێ، مرۆڤ لە ڕێگەی دایکییەوە تەواو فێری نابێ، چونکە نووسین سیما و ئەدگاری ئەم جۆرە زمانەیە و زمانی دایك زیاتر زمانی ئاخاوتنە نەوەك نووسین[2].

عەلی ئەشرەف سادقی دەڵێت: ((زمانی ستاندارد بە زمانێك دەزانێ، کە لەبەرانبەر شێوەزاری ناوچەیی و کۆمەڵایەتی باو لە یەك دەوڵەت هەیە و وسیلەیەکی پەیوەندی کۆمەڵایەتی و زانستی و ئەدەبی کەسانێکە، کە ڕەنگە لە شوێنی تر بە شێوەزاری ناوچەیی تایبەتی خۆیان قسە بکەن. ئەو زمانە هەمیشە هەر ئەو زمانەی خوێندەوارانە و زۆربەی جار لەگەڵ زمانی نووسین یەك شتە و، هەر ئەو زمانەیە کە لە ڕادیو و تەلەفزیۆن و ڕۆژنامە بەکاردەهێنرێت و بۆ فێربوونی کەسانی بیانی

---

[1]- یحیی مدرسی ١٣٦٨(١٩٨٩)، در امدی بر جامعه شناسی زبان، تهران، مؤسسه مطالعات وتحقیقات فرهنگی، ص ٢٣٢ – ٢٣٣.

[2]- سەلام ناوخۆش و نەریمان خۆشناو(٢٠١٠) ستانده‌ربوونی زمانی کوردی،...، ل ٩٣ – ٩٤.

سوودی لێ وەردەگیرێت. واتە زمانی ستاندارد، زمانێکی جێگیرە و خاوەنی چەند بنەچە و بنەمایەکە و ڕێزمانی تایبەتی خۆیەتی، کە لەلایەن بەکارهێنەرانی دەبێ گرنگی تایبەتی خۆی پێ بدرێت))(١).

هەروەها عەلی ئەشرەف سادقی لە شوێنێکی تردا دەڵێت: ((شێوەیەکە لە زمان کە لە سەرەوەی زاراوەکانی ناوچەیی و کۆمەڵایەتی وڵاتێکدا جێی گرتووە و بووەتە ئامرازی پەیوەندیی کۆمەڵایەتی، زانستی و ئەدەبی کەسانێك، کە لەوانەیە لە دۆخ و شوێنی تایبەتی خۆیاندا بە زاراوە و دیالێکتی خۆیان بدوێن، ئەم زمانە زمانی خوێندەوارانە و لەگەڵ زمانی نووسیندا یەکە))(٢).

ترادگیل دەڵێت:((زمانی ستاندارد شێوە زمانێکە، کە لە ڕۆژنامە و چاپەمەنییەکاندا بەکاردێت و لە قوتابخانەکاندا پێی دەخوێنن، هەروەها زمانێکە خوێندەواران ئاخاوتنی پێدەکەن و لە میدیاکاندا بەکاردەهێنرێت))(٣).

ڕەفیق سابیر دەڵێت:((زمانی ستاندارد لە ناوەرۆکدا زمانی ئەدەبیی یەکگرتووە لە فۆرمێکی سیاسیی ـ یاساییدا، کە لە سەردەمێکی مێژوویی ژیانی نەتەوەدا پێکدێت، لە پرۆسێسی بەرەوپێشچوون و بڵاوبوونەوەیدا، بنچینەی هاوبەشی پێکەوە هەڵکردن و هاوئاهەنگی نەتەوەیی دادەڕێژێت و ڕەوایی ستانداردبوونی خۆی دەسەلمێنێت، سەرەنجام بەرەو بە ستانداردبوون دەچێت))(٤).

---

[1]- علی اشرف صادقی ١٣٧٥ (١٩٩٦)، زبان معیار– دربارۀ زبان فارسی، زیر نظر نصرالله پورجوادی، تهران، مرکز نشر دانشگاهی، ص ٢٩.

[2]- علی اشرف صادقی ١٣٦٢ (١٩٨٣)، زبان معیار، نشر دانش، ص ١٦.

[3]- پیتر ترادیگل ١٣٧٦ (١٩٩٧)، در امدی بر زبان و جامعه، ترجمەی محمد طباطبایی، مؤسسته انتشارات اگاه، چاپ اول، تهران، ص ٢٣.

[4]- ڕەفیق سابیر(د)(٢٠٠٨)، هەمان سەرچاوە، ل ٢٣.

گارڤین دەڵێت:((زمانی ستاندارد شێوەیەکی چەسپاوە لە زماندا، کە لەلایەن بەشێکی بەرچاو لە کۆمەڵەیەکی زمانیدا وەکو نموونە پەسندکراوە، زمانی ستانداردیش چەندین تایبەتمەندی هەیە، وەکو: نەگۆڕی هەڵسووڕان و وردبینی و کارامەیی))[1].

پۆل دەڵێت:((زمانی ستاندارد شێوەیەکە لە زمان، کە بە فەرمی لە وڵاتێکدا ناسراوە و لە ڕۆژنامە و قوتابخانە و کتێبدا پێی دەنووسرێت و وانەی پێ دەڵێنەوە))[2].

میر جەلالەدین کەزازی دەڵێت:((زمانی ستاندارد ئەو زمانەیە کە قوتابییان و دەرچووانی قوتابخانە و زانکۆکان چ لە نووسین و چ لە ئاخاوتن بە کاری دەبەن))[3].

ئەحمەد سەمیعی دەڵێت: ((ئەو شێوە زمانەیە کە پەیوەستە بە هەرێمی نەتەوەیی و گشتی وڵاتێکەوە و لە نێوان هەموو خوێندەوارانی ئەو وڵاتە هاوبەشە))[4].

ڕەهبەر مەحموود دەڵێت:((زمانی ستاندارد زمانێکە کە ڕێساکانی کۆکراوەتەوە و نووسراوەتەوە و لە قۆناغەکانی دواتریشدا ئەو ڕێسا کۆکراو و نووسراوانە لەلایەن کۆمەڵگەیەکی زمانییەوە وەرگیراوە و بەکارکراوە))[5].

---

1- Garvin, (1976) "Some comments on language planning", Georgetown University press, Washington Dc. Pp. 24.

2- جورج یول ١٣٨٥ (٢٠٠٦)، بررسی زبان (ویراست سوم)، ترجمەی علی بهرامی، انتشارات رهنما، چاپ اول، ص ٢٧٠.

3- میر جلال الدین کزازی ١٣٧٦ (١٩٩٧)، پرنیان پندار، روزنە، تهران، ص 237 .

4- احمد سمیعی ١٣٧٨ (١٩٩٩)، نگارش و ویرایش، تهران، ص ٣٢.

5- ڕەهبەر مەحموود زادە(٢٠١٠)، جووت ستانداردبوون بۆ زمانی پێوەر، دۆخی تێبەڕینە نەك مانەوە، هەفتەنامەی فەرهەنگ، ژ(٤٣)،ئابی ٢٠١٠، ل ١٤.

واتــە پێوەربــوونی زمــان بەســتراوەتەوە بــە ڕێســا بەنــدبوونی شــێوەی بەکارهێنانی ئەو زمانە و ڕێژەی پێوەر بوونی زمـان، زیـاتر دەبەسـتێتەوە بـە ڕادەی گەڕانەوەی بەکارهێنەرانەی ئەو زمانە بۆ ڕێسـا دیاریکراوەکـانی زمـان بـە مەبەسـتی چارەسەرکردنی گرفت و کێشە زمانییەکان[1]. بەو واتایەی زمانی پێوەر زمانێکـە کـە لە هەنگاوی یەکەمدا ڕێساکانی تەدوین کرابن و لە هەنگاوی دووەمیشدا ئەو ڕێسایانە چەسپابن[2].

ئەگەر سەرنج بدەینە ئەو پێناسانە، دەگەینە چەند دەرەئەنجامێك، كە یارمەتیمان دەدات بۆ پێناسەیەكی تازەی زمانی ستاندارد[3]:

١ـ زمانی ستاندارد، لە بنەچەدا یەكێكە لە شێوە زمانییەكانی باوی نێو كۆمەڵگە.

٢ـ گۆڕانكارییەك لە دروستكردنی ئەو شێوە زمانە ڕوویداوە.

٣ـ زۆربەی كۆمەڵگای زمانی ئەو زمانە بە سەرچاوە دادەنێن و پەسندی دەكەن.

٤ـ زۆربەی كۆمەڵگای زمانی ئەو زمانە لە هەندێ كات و سات و شوێندا بەكاری دێنن.

بەشێوەیەكی تریش دەتوانین پێناسەی زمانی ستاندارد بكەین:ـ

زمانی ستاندارد یەكێكە لە شێوەكانی زمانی باو لە كۆمەڵگای زمانیدا، كە بە گۆڕانكارییەك لە شێوەو چۆنیەتی دروستكردنی، و ڕۆڵ و بەكارهێنانی دروست بووە، و لەلایەن زۆربەی خەڵكی كۆمەڵگای زمانی بە سەرچاوەی زمانی دادەنرێت و لە نووسین و گوتندا بەكاردێت.

---

[1]- هەمان سەرچاوە، ل ١٤.

[2]- هەمان سەرچاوە، ل١٥.

[3]- ناصر قلی سارلی، هەمان سەرچاوە، ص ٤٢.

بەڵام لە ڕوانگەی گونجاندنەوە، زمانی ستاندارد زمانێکە کە کەمترین جۆراوجۆری لە ڕوخساریدا و زۆرترین جۆراوجۆری لەڕۆڵیدا هەیە، واتا زۆرترین پەیوەندی دروست بکات و بتوانێت لە جێگەی شێوەکانی تری زمان بەکاربێت.

لە هەندێ وڵاتدا سیاسەتی زمانی ئەوان لەسەر بنەمای زیادبوون و بڵاوبوونەوەی زمانییە، ڕەنگە دوو زمان یان چەند زمانێك لەگەڵ یەکتر ببنە ڕەسمی، بۆ نموونە لە کەنەدا زمانی ئینگلیزی و فەڕەنسی هەردووك بەیەکەوە ڕەسمین و هەردوو زمانەکە لەسەرتاسەری وڵات بەکاردێن. لە هەمان کاتیشدا ڕەنگە زمانێك تەنها لە ناوچەیەکی تایبەت ڕەسمی بێت، بۆ نموونە زمانی (ڕۆمانشی) تەنیا لە ویلایەتی گیرسۆنی سویدی زمانی ڕەسمییە[١].

## ٢-٣: سیفەتی جۆرەکانی زمان

(ستیوارت) و (هایمز) پێشنیازی (هەشت) سیفەت دەکەن بۆ (جۆرەکانی زمان)، کە بەهۆیانەوە زمانەکان لەیەکتر جیادەکرێنەوە، کە بەمشێوەیەی خوارەوەن[٢]:

**١- ستانداردکردن:** بەلای ستیوارتەوە تەنیا تۆمارکردن بەس نییە، بەڵکو دەبێت ڕەزامەندیی کۆمەڵگاش لەسەر ئەو زمانە هەبێت هەتا پێی بگوترێت زمانی ستاندارد، بەلای ئەوەوە پرۆسەی ستانداردکردن، سیمایەکە بەسەر ئەوانی تردا دەسەپێنرێت، زیاتر لەوەی مۆرکێکی خۆرسك بێت لە خودی زمانەکە، بۆیە پرۆسەی ستانداردکردن لە هەموو کاتێکدا دەکرێت ڕووبدات.

[١]- ناصر قلی سارلی، هەمان سەرچاوە، ص ٤٥.

[2]- Ali Mahmood jukil (2004), The process of standardization with reference to Englishand Kurdish languages. P.H.D., University of Salahadin, Erbel, p. 8 – 9.

**٢ـ زیندوویەتی:** ئەمە سیفەتێکە بەهۆیەوە جۆرەکانی زمانی پێ لێك هاوێر بکرێت، بەتایبەتی زمانی یەکەم و دووەم، ئەم سیفەتە زیاتر لەسەر ئەو بنەمایەیە، ئایا کۆمەڵگایەکی ئاخاوتنی زیندوو قسەکەری زگماکی هەیە، یان نا؟ هەر زمانێك زیندوویەتی خۆی لەدەست دەدات، کاتێك کۆمەڵگای ئاخاوتن قسەکەری نامێنێ.

**٣ـ مێژوویەتی:** ئەمە سیفەتێکە بەهۆیەوە دەتوانرێت زمان بۆ زمانی یەکەم و دووەم دابەش بکرێت، بە تایبەتی لە بارودۆخی زمانی پیجن (Pidgin Language)، کە لە بنەڕەتدا بە واتایەك بە زمانی دروستکراو دادەنرێت، بەڵام دەتوانێت گەشە بستێنێ، هەر کاتێ کۆمەڵگای ئاخاوتنی بۆ پەیدابوو، بە تایبەتی بۆ ئەوانەی کە زمانی یەکەمیان نییە، بەڵکو ئەرکی زمان لێك تێگەیشتن (Lingua Franca) دەبینێت.

**٤ـ هاوتوخمیەتی:** بەلای ستیوارتەوە ئایا ڕێزمانە بنەڕەتییەکە و وشەسازییەکەی زمانەکە لە هەمان قۆناغەکانی پێشتری خۆی هەڵێنجاوە، یان نا، بۆیەش دەبینین زۆربەی زمانەکانی جیهان خاوەنی هاوتوخمەیتین، چونکە بنەماکەیان قۆناغەکانی زمانی پێش خۆیانن، بەڵام هەندێك لە زمان هاوتوخمیەتییان نییە.

لە ساڵی ١٩٦٨، هەندێك کێشە و گیروگرفت دەربارەی جۆراوجۆری زمانەکان ڕوویدا، بە تایبەتی کە دەتوانرا "گۆڤەر" و (دیالێکت) لێك جیا بکرێتەوە، بۆیە ستیوارت سیفەتی (هاوتوخمیەتی) بەلاوە نا و سیفەتێکی نوێی بە ناوی (ئۆتۆنۆمی) داڕشت.

**٥ـ ئۆتۆنۆمی:** ئەم سیفەتە زیاتر پێوەندی بەوەوەیە ئایا ئەوانەی زمانەکە بەکاردەهێنن پێی ڕازین، یان نا؟ لەوەی کە زمانێکی جیاوازە و جیاوازی لەگەڵ زمان و شێوە ئاخاوتنەکانیدا هەیە، هیچ کێشەیەك لەسەر (ئۆتۆنۆمی) دوو زمان، یان دوو دیالێکت ڕوونادات، کە جیاوازییەکی دیار و بەرچاویان لە نێوانیدا هەبێت، بەڵام کێشە ڕوودەدات، کاتێك لێکچوونێکی بەرچاو لەنێوان زمانی ستاندارد و دیالێکتی

هەرێمیی، یان کۆمەڵایەتیدا هەبێت، بە تایبەتی لەلایەن ئەوانەی ئۆتۆنۆمییان بۆ گۆڤەرەکە دەوێت.

چەندین کێشە لە بارەی سیفەتەکانی ستیوارت ڕوویداوە، بە تایبەتی لەسەر سیفەتی (ئۆتۆنۆمی)، کە بەلای نیتشەوە ستانداردکردنە، واتە بوونی تۆمارکردن، بەهۆی نەبوونی ڕەزامەندیی لەلایەن ئەوانەی بەکاری دەهێنن، هەر لەبەر ئەمە (هایمز) سێ سیفەتی نوێی زیادکرد و بە سیفەتی (مێژوویەتی)شدا چۆوە.

لەم پێداچوونەوەیەدا (هایمز) پشتی بە بۆچوونەکانی (فیشمان) بەستووە، لەوەی کە ئایا کۆمەڵگا پەیوەستە، یان نا بەوەی مێژوویەك بۆ زمانەکە بدۆزێتەوە، بە بۆچوونی ئەو لە ڕابردوودا باو و باپیران هەوڵیان داوە ئەفسانە بخولقێنن، تا بنەچەکە و گەشەسەندن و مێژووی زمانە ستانداردەکە دیاری بکەن.

٦- **تێکەڵی:** ئەم زاراوەیە ئەوە دەگرێتەوە کە ئایا زمانەکە لە بنەڕەتدا یەکە و ڕۆنانی خوازراوی وای تێدایە، یان نا، کە لە دەرەوەی سەرچاوەکانی خۆی بێت، بە مانای ئەوەی ئایا زمانەکە وشە و زاراوە و ڕۆنانی بێگانەی تێکەڵ بووە، یان نا، بەڵام لە ڕاستیدا هیچ زمانێك نییە، کە بە تەواوی پەتی بێت، چونکە زۆربەی زمانەکان لە گەشەسەندندا کەم، یان زۆر ئارەزوومەندی خواستنی یەکە و زاراوە دەبن، کە لە زمانەکانی تر دەیخوازن.

٧- **کەمبوونەوە و لەنێوچوون:** ئەم سیفەتە ئەمە دەگرێتەوە، ئایا زمانەکە کەمترین توخمەکانی دەنگسازی و ڕۆنانە پێوەندیدارەکان و کەمترین وشە و زاراوە بەکاردەهێنێت، یان لەوەی کە پەیوەستە بە شێوەی ئاخاوتنی زمانەکە، واتە دەنگەکان و ڕۆنانەکان تووشی سوانەوە و کەمبوونەوە بوونە، یان نا، هەروەها وشە و زاراوەکانی کەمبوونەتەوە لەوەی زمانەکە لە بنەڕەتدا هەیەتی.

**٨ـ دیفاکتۆی نموونەکان:** ئەم سیفەتە ئەوە دەگرێتەوە، کە نموونە بەکارهاتووەکان لە زمانەکە هەرچەندە تۆماریش نەکرابن، بەلاّم کۆمەلگای ئاخاوتن پێی ڕازین.
ئەم سیفەتانەی سەرەوە کە بە سیفەتی نموونەیی دادەنرێن، بۆ ئەوەی ڕۆنانەکانی زمان و شێوەکانی ناوەوە لێك هاوێر بکەن، بەلاّم پێوەرە کۆزمانەوانییەکان کاریگەرییان لەسەر ئەرکەکان و پێوەرەکانی کۆمەلاّیەتیدا هەیە.

## ٢-٣ : لایەنەکانی ستانداردکردن

لەبەر نەبوونی پێناسەیەکی ڕوون و دیاری ستاندارد، ئەوا پێشنیازی ئەوە دەکرێ کە تێگەیشتن لە ستانداردکردن بەم تێبینیانەی خوارەوە ڕاڤە بکرێ و شیبکرێتەوە[١].

١- بوونی یاسا ڕێکخراو و پۆلێنکراوەکانی زمانێك مەرجێکی پێویستە، بەلاّم مەرجێکی قایلکەر نییە، بۆ ئەوەی بە زمانێك بلێین ستاندارد، ئەوا دوو مەرج پێویستن: بەکارهێنان و پەسندکردن[٢].

٢- بەرزبوونەوەی پلەی دیالێکتێك بۆ زمان بەشێوەیەکی گشتگیر پەیوەستە بە بەرەوپێشچوونی نووسین و سەرهەلدانی ئامانجی نەتەوەیی، پرۆسەکە هەلبژاردن و ڕێکخستن و پۆلێنکردنی ڕێسا زمانەوانییەکان لەخۆ دەگرێ[٣].

٣- پرۆسەی ستانداردکردن بریتییە لەوەی، کە زمانەکان ئەنجامی دەستێوەردانی ڕاستەوخۆ و دەسەنقەستن لەلایەن کۆمەلگاوە، ئەم دەستێوەردانە کە پێی دەوترێ

---

1- Ali Mahmood Jukil, p. 6 – 7.
2- Bell, R. (1976), Socioliguistics: Goals, Approaches and Problems, London, Bats ford, p. 148.
3- Haugen, Ener. (1972), Great Britain, Hazell watson viney Ltd, p. 97.

(ستانداردکردن)، زمانێکی ستاندارد بەرهەم دێنێ، کە لەپێشدا تەنها دیالێکتێك بوون[1].

٤ـ ستانداردکردن خودی خۆی چەند ئەرکێك ئەنجام دەدات، قسەکەرەکانی زمانێکی دیاریکراو لەناو کۆمەڵگایەکی گەورەتر یەکدەخات، لەهەمان کاتدا جیابوونەوەی کۆمەڵگایەکی لێدەکەوێتەوە، ئەویش لە ئەنجامی یەکگرتنی کۆمەڵگاکانی ترەوە دەبێت[2].

٥ـ پرۆسەی ستانداردکردن هێنانە کایەی شتێك نییە لە دژی دیالێکتێکی دیاریکراوەوە، بەڵکو شێوەیەکی ئاخاوتنە و وەك پێگەیەکی هاوبەش ڕەفتار دەکات و هەموو توخمە هاوبەشەکانی گشت دیالێکتەکان لەخۆ دەگرێ و توخمی تایبەت بە دیالێکتێك بەلاوە دەنێ[3].

٦ـ ستانداردکردن پەیوەندییەکی تایبەتە کە کۆمەڵگا و زمان بەیەکەوە دەبەستێتەوە، دەکرێ شێوەزارێك بە زمانێکی ستاندارد لەقەڵەم بدرێ، کاتێك لەتوانایدا بێت وەك هۆکارێکی گەیاندنی هاوبەش لە کۆمەڵگادا خزمەت بکات. ئەمەش بەو ڕێگایە ئەنجام دەدرێ کاتێك ئەم شێوەزارە بە ڕاگەیاندنی جەماوەریدا گوزەر دەکات و لە سیستمی ڕەسمی پەروەردەییەوە کاری پێبکرێ[4].

٧ـ ستانداردکردن ئەو پرۆسەیەیە کە تیایدا هەر زمانێك یان دیالێکتێکی بازاڕی، دەکرێ ستاندارد بکرێ و بەشێوەیەکی فراوان لەلایەن قسەکەرەکانییەوە پەسند

---

-Hudson (1980), p. 32.[1]

[2]- Wardhavgh (1986), p. 31.

[3]- Janson, T. and Joseph Tsonope (1991), Birth of a National Language, England, Athenaeum Press, p. 106.

[4]- Bussmann, H, (1996), Routledge Dicrionary of Language and Linguistics, London and New York , p. 45.

بکرێ، ئەویش بەهۆی بە بەرداکردنی بەرگێکی ڕەسمی و ڕێسا نەگۆڕەکانی دەبێت[1].

## ٣ – ٤ : ئاستەکانی زمانی ستاندارد

کلۆس، پێنج ئاستی بۆ زمانی ستاندارد داناوە، کە هەر پێنج ئاستەکەش، یەک کۆمەڵە پێکدێنن[2]:

١ـ زمانی ستانداردی پوخت: هەموو زانستە نوێیەکانی ئاستی زانکۆ، دەکرێت بە هاوکاریی زمانی ستاندارد فێری خەڵك بکرێن، ئەم ئاستە بە بۆچوونی کلۆس، بالآترین ئاستی ستانداردە. هەروەکو ئاشکرایە بەڵگەی کراوەیی ئاستی ئەم جۆرە زمانی ستانداردە، بەکارهێنانی لە ئاستە بەرز و زانکۆییەکاندایە. بەو پێیە کلۆس لە پۆلێنکردنی ئاستەکاندا، بایەخێکی تایبەتی بە ڕۆڵی زمانی ستاندارد وەکو زمانی زانست دەدات، کە زمانی ستاندارد زمانی ڕەسمی وڵاتە[3].

٢ـ زمانی ستاندارد لە گرووپ (نەتەوە)یەکی کەمدا: بەربڵاوییەکانی زمانێکی ستانداردی ئاوا، سەردەمێك گونجاوبوون، بەڵام ئێستا کۆمەڵەی زمانیی ئەو جۆرە زمانانە ئەوەندە بچووکە، کە هەرگیز ناتوانرێت قەڵەمڕەوی فرەوانی شارستانیەتی نوێ، بەهۆی ئەوانەوە بناسرێت. واتە ئەگەرچی لەم قۆناغەدا زمانی ستاندارد لەمێژە

---

[1]- Hangen, Ener, (1994), Standardi zation, the Encyclopedia. Of language and Linguistics Vol, Great Britain, p. 40.

[2]- ناصر قلی سارلی ١٣٨٧ (٢٠٠٨)، ل ٩٠ – ٩١.

[3]- غازی عەلی خورشید (٢٠٠٦)، پرۆژەی ستانداردکردنی زمانی کوردی، گ. ئەکادیمی، ژ (٤)، کۆڕی زانیاری کوردستان، ل ٢٣٧.

هەیە، بەڵام وتاری هاوبەش زۆر کەمە و ناتوانێ زۆربەی بوارەکانی ژیان بگرێتەوە.[1].

٣ـ زمانی ستانداردی لاو: ئەو جۆرە زمانە ستانداردە بە هاوکاریی فەرهەنگەکانی زمان و کتێبەکانی ڕێزمان و ئامرازەکانی لەو بابەتە، تازە نووسراوە و جێگیرکراوە. ئەم زمانە بۆ فێرکردنی قۆناغی سەرەتایی گونجاوە و بەکاردەهێنرێت، بەڵام ئێستا بۆ ئاستەکانی زانکۆ و خوێندنی باڵا، توانا و لێوەشاوەیی پێویستی نییە، واتە بەکار ناهێنرێت.

٤ـ زمانی بە ستانداردنەبووی خاوەن ئەلفوبێ: ئەم جۆرە زمانە هاتۆتە بواری نووسین، بەڵام جارێ نەبۆتە زمانی ستاندارد، زمانێکی وا کتێبگەلی ڕێزمان و فەرهەنگی زمانیشی هەیە. ئەم جۆرە زمانە لە ماوەیەکی کورتدا یان تەنانەت لە ماوەیەکی مامناوەندیشدا دوورە بتوانێت لێوەشاوەیی و توانای ئەوە پەیدا بکات، کە وەکو زمانی ستاندەری پوخت، ببێتە ئامرازی فێرکردنی تەواوی زانستەکانی زانکۆ.

٥ـ زمانی پێش نووسینی هونەریی: ئەو زمانە یان هەرگیز هیچی پێ نەنووسراوە، یان بە دەگمەن شتی پێ نووسراوە، واتە زمانێك کە هێشتا پرۆسەی پەرەسەندنی زمانی ستانداردی بە خۆوە نەدیوە[2].

---

1- هەمان سەرچاوە، ل ٢٣٧.

2- هەمان سەرچاوە، ل ٢٣٧.

### ٥-٣: شێوەکانی زمانی ستاندارد

زمانی ستاندارد بۆ ئەوەی بتوانێ ڕۆڵ و ئەرکەکانی خۆی بە دروستی و تەواوی ئەنجام بدات، دەبێت شێوەی تایبەت بە خۆوەی هەبێ. خاوەنداریەتی ڕێکخستنی شێوە و جۆراوجۆرەکانی زمانی ستاندارد هەلومەرج و زەمینەی بەکارهێنانیەتی، هەلومەرج و تایبەتمەندی زمانی هەیە و جیاوازییەکانی ئەو جۆرە شێوازانە لەوەوە سەرچاوە دەگرن، کە شێوەکانی بۆ ستاندارد هەڵدەبژێردرێن، بەگشتی بنەما و ڕێسای نووسینیان هەیە و جۆرێك گوتاری دەدەنێ.

لە زۆر کۆمەڵگادا، هەوڵ دەدرێ زمانی ستاندارد لە هەموو شوێنێك بەکار ببرێ[1]، لەبەرانبەردا لە هەندێ کۆمەڵگای دیکەدا، بەکاربەری ئەو زمانانە بە دەسەڵاتی تایبەتی بەستۆتەوە، بەو جۆرە کەم تا زۆر لە زۆربەی کۆمەڵگاکاندا زمانی ستاندارد لە چوار شێوە پێکدێت: شێوەی زانستی یان زمانی زانستی، شێوەی ڕاگەیاندن (ڕادیۆ، تەلەفزیۆن، چاپەمەنی غەیرە پیشەیی)، شێوەی کارگێڕیی و شێوەی ئەدەبی[2].

#### ١- شێوەی زانستی

زمانی زانستی لە زمانی ئاخاوتن جیایە و زیاتر پێویستی زۆری بە زاراوە زانستییەکان و زمانەوانییەکانە، وەك ناوەندێکی فێرکردن لە سیستمی قوتابخانە فەرمییەکان و زانکۆکاندا بەکاردێت، هەر زمانێکیش لە ئاستی خوێندنی باڵادا بەکاربێت، گەشەسەندن و پێشکەوتنی بەخۆیەوە دەبینێت، بەڵام ئەگەر تەنیا لە

---

[1]- ناصر قلی سارلی، ل ١٣٩.

[2]- هەمان سەرچاوە، ل ١٤٠.

قۆناغەکانی سەرەتایی بەکاربێت، ئەوە بە زمانێکی پاشکەوتوو دادەنرێت و بەرەو پێش ناچێت[1].

لە بارودۆخی زمانێك کە دەبێ بۆ بابەت و بەرەوپێش بردنی زانست بەکاربێت، لە زۆربەی کۆمەڵگادا دوو ڕێگای دژ بەیەك هەن: هەندێك پێیان وایە زمانێك کە لە زانست بەکاردێت، دەبێ یەکێك لە زمانە پێشەنگەکان بێ، تا بیرمەندان و قوتابیان بتوانن لەڕێگەی ئەو زمانە جیهانییەوە بە ئاسانی بە ئەنجامێك بگەن، کە تێکڕای فەیلەسوفان بەدەستیان هێناوە[2]، بەراورد بە ڕاپۆرتی (ڕای) (١٩٦٨) لە وڵاتانی باکووری ئەورووپا ئەو ڕێگا چارەسەرە لەوانی دیکە لەپێشترە. بۆنموونە دوای ماوەیەك کە زۆرێك لە بەرهەمی بەرچاو بە زمانەکانی هۆڵەندی و دانیمارکی بڵاوکرانەوە، ئەمڕۆکە ئەگەری کەمتر بەرچاو دەکەون کە فەیلەسوفانی هۆڵەندی و دانیمارکی، بەرهەمی زانستی پلە یەکیان بۆ یەکەمین جار بە زمانی زگماکی خۆیان بڵاوبکەنەوە[3]. ڕێگاچارەیەکی دیکە ئەوەیە کە زمانی وڵات وا پەروەردە بکرێت و بەرەوپێش ببرێت، کە بتوانێ بە ناونیشانی زمانی زانست دەور و ڕۆڵی ببینێ، مەبەست لە شێوەی زانستی زمانی ستاندارد، شێوەیەکە لە هەمان زمانی نەتەوەیی کە لە کایە جۆراوجۆرەکانی زانستیدا بەکاردەبرێت[4].

---

1- عەلی مەحموود جوکل(د)(٢٠١١)، چەمکەکانی بە ستانداردکردنی زمانی کوردی، گ. ڕامان، ژ (١٧١)، ٥/٨/٢٠١١.

٢- ناصر قلی سارلی، ل ١٤٠.

٣- Ray, P. S(1968), Language Standardiziation, Readings in the Sociology of Language, Ed by J. A. fishman, The Hague, Mouton, pp 754 – 765.

4- ناصر قلی سارلی، ص ١٤٠ – ١٤١.

مەبەست لە زمانی زانست، ئەو شێوە بەکارهێنانەی زمانە کە لە زانستدا بەکاردەهێنرێ، بەڵام لق و پۆی جیا جیای هەیە و هەریەك لە لقەکان پەیوەستە بە زاراوەناسی و ڕێساکانی زمانی تایبەتی خۆی[1]. لەگەڵ ئەوەشدا بۆ زمانەوانیش دەتوانرێ هەندێك (شێوەی لاوەکی) لەبەر چاوبگرێت. هەر یەکێك لەو شێوە لاوەکیانە دەستەواژەی تایبەت بە خۆیان هەیە، هەندێك دەستەواژەی گشتیش لەو شێوە لاوەکیانە مانای تایبەتیان لەگەڵ شێوەکانی دیکەی زماندا هەیە، جیاوازی شێوەکان، تەنیا بە دەستەواژەکان پەیوەند نییە، بەڵکو هەر ڕێچکەیەکی زانستی کلتووری زمانی تایبەتی خۆی هەیە و شێوازێکی دەرخستنی بابەت و زانست لە وانەدا جیاوازە. هاوئاهەنگی و یەکپارچەیی سەرمەشقی شێوە لاوەکییەکانیش پلەی جۆراوجۆریان هەیە، بەشێوەیەکی گشتی شێوە لاوەکییەکان پەیوەست بە زانستی مرۆیی یەکپارچەیی و هاوئاهەنگی کەمتریان هەیە و وردبینی دەستەواژە لەوانەدا کەمترە، لە کاتێکدا زانستی سروشتی و بنەمای یەکپارچەیی و هاوئاهەنگی زیاتر لەخۆ دەگرن و تاڕادەیەك وردبینی واژە و دەستەواژەکانی ئەوانە لە زانستی مرۆیی زیاترە[2].

شێوەی زانستی یان زمانی زانستی، وردترین بەکاربەری زمانی ستانداره لە کۆمەڵگای زماندا، بچووکترین لادان لە ستاندارد دەبێتە هۆی ڕەخنەی فەیلەسوفان و پارێزەرانی زمان، نابێ پێمان وابێ کە زمانی زانستی تەنیا بە کتێب و وتارگەلی زانستی و هەندێك لە کۆڕی زانستی بەستراوەتە، بەڵکو کتێبە مەنهەجییەکان بە

---

[1]- علی محمد شناسی ۱۳۷۲ (۱۹۹۳)، در جستجوی زبان علم، مجموعه مقالات سمینار زبان فارسی و زبان علم، زیر نظر علی کافی، تهران، مرکز نشر دانشگاهی، ص ۱۳ – ۱٤.

[2]- ناصر قلی سارلی، ص ۱٤۱.

تایبەت کتێبی فێربوونی زانست، دەتوانرێ بەشێوەی کۆمەڵی زانست لە قەڵەم بدرێ[1].

لە هەندێك وڵاتاندا تەنانەت لەو وڵاتانەی کە لەڕووی زانستییەوە پێشکەوتوون و زمانی پێشەنگیان هەیە، دەشێ بەشە زانستییە تایبەتەکان، یەکێك لە زمانە بێگانەکان بەناونیشانی زمانی زانستی ڕۆڵی خۆی بگێڕێ، بۆ نموونە تا جەنگی جیهانی دووەم زۆر لە کتێبە پرۆگرامییەکانی بەشی کیمیا لە زانکۆکانی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا بە زمانی ئەڵمانی بوون، لە توێژەرانی بەشی کیمیا چاوەڕوان دەکرا توانایی بەرەوپێش بردنی توێژینەوەی زانستی خۆیان بە زمانی ئەڵمانی بێت[2]. ئەگەر زمانی ستاندارد بتوانێ بە باشی بەناونیشانی زمانی زانستی ڕۆڵی خۆی ببینێ، پلەی پێوانەیی باڵای ئەو دەکرێ قبوڵ بکرێ.

لەڕووی ستانداردەوە (کلۆس) و تاڕادەیەك (فێرگسۆن) لە دیاریکردنی پلەی ستانداردی زمان، توانینی بە ناونیشانی زمانی زانستی مایەی فێربوونی (پەروەردە)کردنی زانست و شێوەکان تا ڕادەی خوێندەواری زانکۆیی و خوێندنی باڵایە[3].

زمانی زانستی پەیوەندی ڕاستەوخۆی بە پێشکەوتنی زانستەوە هەیە. لە وڵاتە پێشکەوتووەکاندا زانست و تەکنەلۆژیا، تاڕادەیەك ڕۆڵێکی باشیان بۆ پێشکەوتنی توانای زمانی زانستی هەیە و بەدەستی ئەوان دەستەواژە و واژە دروست بوون، کە لەگەڵ هێنانی کاڵای زانست و تەکنەلۆژیادا دێتە وڵاتە پێشکەوتووەکان، لەگەڵ ئەوەشدا تا ئێستا لەزۆر وڵاتدا، زمانی زانست ئینگلیزی و فەڕەنسی بووە، بەڵام

---

1- هەمان سەرچاوە، ل ١٤٢.

2- سەرچاوەی پێشوو، ل ١٤٢.

3- هەمان سەرچاوە، ل ١٤٣.

چالاکی ڕێکخراویی بەرنامە بۆ دارێژراو لەو وڵاتانەدا لە ئارادایە تا زمانی خۆماڵی ڕۆڵ ببینێ، لەزۆر وڵاتاندا وا لێك دەدرێتەوە، کە ئەگەر زمانی خۆماڵی بەناونیشانی زمانی زانست ڕۆڵ ببینێ، ئەوا ئەو وڵاتە وڵاتێکی دواکەوتووە و بە پێش نەکەوتوو لە قەڵەم دەدرێت، بەهەرحاڵ، پلەبەندی ئاخاوتنی زمان، بەتایبەت پلەبەندی دراو توانای بە ناونیشانی زمانی زانست، بەوجۆرەی فرگسۆن پێشنیاری دەکات، بە یەکێك لە هۆکارەکانی زمانی پێشکەوتنی نەتەوەیی لەقەڵەم دەدرێت[1].

### ٢ـ شێوەی ڕاگەیاندن

شێوەی ڕاگەیاندنی ستاندارد، زمانێکە کە لە ڕادیۆ و تەلەفزیۆن و ڕۆژنامە و چاپەمەنی و دواتر لە ئینتەرنێتدا بەکاردەبرێت، ئەو شێوە ئاخاوتنە، بە زۆر بەڵگەوە لە بەکارهێنە باڵاکانی ستاندارد ناژمێردرێت، دەربڕینی ئەو شێوە زمانە، خەڵکی ئاسایین. بەهەمان هۆوە پلەبەندی پەروەردەیی و سەرنجدانی بەشێوەی زانستی بەهیچ شێوەیەك بەراورد ناکرێت[2]. ئەو شێوە ستانداردە تارادەیەك لە دەستەواژەی ورد و هونەریی خاڵییە و وشە و دەربڕینی بەکارهاتووی تێدایە و لە گوتار نزیکترە. لە ڕاگەیاندنەکانی ئەمڕۆدا خێرایی لە بواری هەواڵ و زانیاری تازە بۆ بەکارهێنەرانیەتی، بەهەمان هۆوە هەڵە و غەڵەت لەسەرمەشقی زمانی ڕاگەیاندندا ڕێگا دەکاتەوە، بۆیە بەهەمان هۆوە ڕاگەیاندنەکان بەسەرچاوەی هەڵەی زمانی دەزانن.

---

١- Ferguson C. A.(1996) , Diglossia, Repr in Sociolinguistic Perspectives, Ed by Thom Heubner, Oxford, Oxford University Press, PP. 267 – 271.

٢- علی اشرف صادقی، زبان معیار، درباره زبان فارسی، ص ٢٩ — ٣٠.

له ڕاگەیاندندا زمان دەخرێتە ئەركەوە، بۆ ئەوەی ئامانج و سیاسەتی ڕاگەیاندن جێبەجێبكرێت، بۆیە پێویستی بە ڕۆنانی تایبەت و هەڵبژاردنی وشە و زاراوەی كاریگەر دەبێت، بێگومان زمانەكەش بە پێی مەبەست و هەڵوێست دەگۆڕێت، بگرە هەر لە دووبارەنەكردنەوە و وشە گۆڕینی پێكهاتە و نەرمە هەواڵ و ئابووری كردن لە وشە و زاراوە و بەكارهێنانی دەستەواژەی تایبەت... تاد، ئەمانە هەمووی لە خانەی زمانی ڕاگەیاندندا دەبێت[1].

شێوەی ڕاگەیاندن چەند جۆری هەیە، شێوەی زمانی ڕادیۆ و تەلەفزیۆن، لەگەڵ شێوەی زمانی ڕۆژنامەكاندا جیاوازە، زۆر لە بەكارهێنەرەكانی زمانی ڕادیۆ و تەلەفزیۆن گوتاری نووسراون، واتە بێژەرەكان و بەڕێوەبەران بابەتی جیاواز لە ڕووی نووسراوەوە بۆ گوێگران دەخوێننەوە، بەشێك لە گوتارەكانی ڕادیۆ و تەلەفزیۆن لە ڕاستیدا نووسراون، لەو گوتارانەدا پلەی ستاندارد لە خوارترە، یان بەشێك لە گوتارەكانی ڕادیۆ و تەلەفزیۆن وەكو بەشی هەواڵ تاڕادەیەك لە پلەی ستاندارد پەسند دەكرێن[2].

گوتارەكانی ڕادیۆ و تەلەفزیۆن هەندێك لە تایبەتمەندی نووسین و هەندێكیش لە تایبەتمەندی گوتارییان پێوەیە، هەندێ نووسەرانی ڕادیۆ و تەلەفزیۆن جیاوازی بابەتێك كە دەینووسن لەگەڵ نووسین و گوتار لە بیر دەكەن، بەهەمان هۆوە هەندێ جار دەبینرێ كە لە بەشی هەواڵدا ڕستەگەلێك بە ئامرازی ئاڵۆز و درێژ وەكو نووسین بەكاردەهێنرێ.

شێوەی زمانی ڕۆژنامەكان لەسەر یەك تاڕادەیەك سەرمەشقی زمانی پەروەردە نییە و بەو هۆیەوە لە بەكارهێنانەكانی ستانداردی باڵا ناژمێردرێ. لەسەرووی

---

1- عەلی مەحموود جوكل(د)(٢٠١١)، ل ١٢٠.

2- ناصر قلی سارلی، ل ١٤٣.

واژەکانەوە ئەو شێوە زمانە لە وردی و پەورەردەییەوە دوورە، بنچینە دەستورییەکانی ناو ستاندارد کەم و زۆر لە شێوەی زمانی ڕۆژنامەدا دەبینرێ، هۆکاری ئەوە یەك هەڵپەی ڕۆژنامەکانە لە نووسیندا و خستنەڕووی بابەت و زانیاری و ئەویتریان ڕادەی نزمی خوێندەواری و ڕادەی زانیاری نووسەرانە[1].

شێوەی ڕاگەیاندنی ستاندارد، یان دەرخستنی سەرمەشقەکانی زمان لە کەم و کوڕییە جیاوازەکانی چاپ، بینین و بیستن بەرەبەرە هۆگری زیاتر پەیدا دەکات لەگەڵ سەرهەڵدانی ڕاگەیەنەری تازەدا وەك ئەنتەرنێت و سەرنجدان بە زمانی میدیایی و گرنگیدان بە نزیکبوونەوە لێی دەگاتە ئاستێکی باڵاتری ستاندارد و گرنگی بەدەست دەهێنێ[2].

### ٣ـ شێوەی کارگێڕیی

مەبەست لە شێوەی کارگێڕیی بەکاربەری زمانی باوە لە بەڕێوەبردنی دەوڵەتدا، بابەتی یاسا و ڕێسا دانپێدانراوی دامەزراوە دەوڵەتییەکان دەتوانرێ بە بەشێك لە شێوەی کارگێڕیی لەقەڵەم بدرێ، لە بەشی بابەتی یاسایی بەتایبەتی لەبەرچاوگرتنی ڕوون و ڕۆشنی گرنگییەکی فراوانی هەیە، پەروەردەکردن و سەرنجدانی واتای وشە پەیوەستە بەو شێوە زمانە. لە بەشێك لەو وڵاتانەدا ڕوون نەبوونی وشە و دەستەواژە دەبێتە هۆی فرەواتایی لە بابەتی یاساییدا، کە ئەمەش کێشەی سیاسی و کۆمەڵایەتی فراوان پەیدا دەکات. بۆیە بۆ خۆ لادان لەو جۆرە کێشانە پێویستی بە خاوەنداریەتی ستانداردی گرنگ هەیە، نامە کارگێڕییەکان بە بەشێك لە شێوەی کارگێڕی ستاندارد حیساب دەکرێن.

---

[1]- سەرچاوەی پێشوو، ل ١٤٤.

[2]- هەمان سەرچاوە، ل ١٤٤.

ئەو نامانە تاڕادەیەك بنەمای تایبەتییان هەیە و بەشێوەیەکی وێژەیی دەنەخشێنرێن، سادەیی و ڕوونی یەکێك لەو تایبەتمەندییانەی نامەی ئیدارییە، کە کورت و پوخت دەنووسرێت[1]. بەخشنامەکان و دەستووری کاری دەوڵەتیش لەو بەراوردە شێوە کارگێڕییانەیە، چاوەڕوانی ئەوان لە بەخشنامە و دەستووری کاردا سادە و ڕوون و کورت و پووخت بن، چونکە لەو بەکاربەرە زمانیانەدا وردبینی وشە و بنەمای ڕوون و سادە زۆر گرنگن[2].

### ٤ـ شێوەی ئەدەبی

شێوەی ئەدەبی ستاندارد، شیعر و پەخشان دەگرێتەوە. زمانی شیعر لەگەڵ زمانی ستاندارد بەو دەربڕینە وردەی، کە ئێمە لەو نووسینەدا مەبەستمانە جیاوازییەکی زۆری لەڕوانگەی ڕەوانبێژییەوە هەیە، داڕشتنی سروشتی دانانی ڕستە لە شیعردا تێکدەدات.

شێوە ڕستەسازییەکان دیارە لەگەڵ شێوەکانی ستاندارد جیاوازن، مانای وشە و ڕستە لە شێوەدا هەندێ جار شاراوەیە، ڕەمزی هونەریی ئێستا ئەگەر مانای وشە و ڕستەی ستاندارد ڕوون و ڕەوان بن، لەگەڵ نووسینی ستاندارد جیاوازە، شیعر بۆ بەرجەستەبوونی لە وێنەی خەیاڵی و دەربڕینە ئەدەبییەکان کەڵك وەردەگرێ، بەڵام بوونی ئەو پێکهاتەیە لە زمانی ستاندارد بەهۆی نەبوونی پەیوەندی بە خەوش دەژمێردرێ[3].

---

[1]- هەمان سەرچاوە، ل ١٤٥.

[2]- هەمان سەرچاوە، ل ١٤٥.

[3]- ناصر قلی سارلی، ل ١٤٦.

سەرەڕای ئەو هەموو جیاوازییانە لە نێوان زمانی شیعر و زمانی ستاندارد، زۆربەی زمانەوانان بەشێوەی زمانی ئاخاوتنی لەقەڵەم دەدەن، واژەی بەشێك لە شیعر لە زمانی بەشێك لە زمانی ستاندارد وەردەگرێ، شاعیر ڕەنگە هەندێ جار توخمی زارەکی یان وشەگەلی کۆن بەکاربێنێ. کەڵك وەرگرتن لە بنەماکانی شێوازی کۆن لە شیعردا ڕەوایە و بەشێوەیەکی گشتی زمانی شیعر هێندە جیاوازی لەگەڵ زمانی ستاندارد هەیە، کە دەبێ ئەوەیان بە شێوەی زمانی جودا بژمێردرێت[1].

زمانی شیعریی بە سەرچاوەی زمانی ستاندارد لەقەڵەم دەدرێت، زۆر لە وشەکان، پێکهاتە و دەربڕینیان ئێستا لە زمانی ستانداردا شاعیران دروستیان کردووە، ئەو سەرمەشقانە بەرەبەرە لە قاڵبی خۆیان هاتوونەتە ناو واژەکانی زمانی ستاندارد، توخمەکانی شیعر تاڕادەیەك زمانی ستاندارد لە جێگای وشە و تەعبیراتی عاتفی و هەستی هەندێك شێوەی ڕستەسازی شاعیران، پاشان لە زمانی ستاندارد دەچنە پاڵ ڕێسای واژە و تێکەڵ بە دەوڵەمەندی زمانی ستاندارد دەبن، هەتا هەندێك بنەمای وەکو دەربڕینی شاعیران دەتوانێ لە پێشکەوتنی بنەمای زمانی ئاخاوتندا یارمەتیدەربێت[2].

ئەوەی بەناونیشانی شێوەی ئەدەبی ستاندارد باس دەکرێ، تەنیا لە پەخشاندا دەبینرێ، هەندێك نووسراوی تەنز ئامێز کە تیایدا ڕێگای گەڕانەوەی ستاندارد نییە و لەوێدا سەرەڕای لەبەرچاوگرتنی ڕوون و ڕەوانی دەستەواژەکانی ستاندارد، کەڵك وەرگیراوە، لەزۆربەی چیرۆکەکاندا کەسایەتی جیاواز بوونیان هەیە، کە هەریەکەیان

---

[1]- هەمان سەرچاوە، ل ١٤٧.

[2]- هەمان سەرچاوە ، ل ١٤٧.

بە یەکێك لە چینی کۆمەڵایەتی یان بە یەکێك لە ناوچە جوگرافییەکان یان یەکێك لە دەورانی مێژوو دەبەسترێنەوە[1].

پێناسەی چیرۆك کە نووسەر تیایدا پەخشانی تایبەتی خۆی تیادا دەنووسێ، دەتوانێ لە ڕێڕەوی شێوەی ئەدەبی ستاندارد حیساب بکرێ، لێرەدا کێشەیەکی دیکە دێتە پێش ڕێچکە جیاوازەکانی پەخشان، زۆربەیان لە ڕێچکەی هاوچەرخی ستاندارد نزیکن، بەتایبەت لە بواری بنەمای دەستووری لە بەشی واژەوە لە ڕێچکەی جیاوازی هەندێ جار لادان لە ستاندارد دەبینرێ، بەهەرحاڵ پێدەچێ بەشێوەیەکی ورد لە بواری ستانداردبوون یان نەبوونی کاربەری زمانی ئەدەبیاتی چیرۆکی هەبێ[2].

دەستەواژەکانی ئەدەبیاتی چیرۆك نووسی دەبێ لەگەڵ فەرهەنگی گشتی زماندا ڕێکبخرێن و پلە و پێوانەی ستانداردی ئەو دەست نیشانی دەکات، ئەگەر لادانە ڕێچکەکانی پەخشان لە ستاندارد لە ڕادەیەکی دیاریکراو هەڵنەکشێ، دەتوانێ بە هەندێك ئاڵوگۆڕ ئەوانە لە بابەتی ستانداردی ئەدەبیدا جێ بکرێتەوە، بەو شێوەیە زۆربەی پەخشانەکانی چیرۆك لە ڕاستیدا بەشێوەی ئەدەبی ئاخاوتن حیساب دەکرێ، ئەدەبیاتی چیرۆکنووسی وەرگێڕدراویش یەکێك لەو بابەتانەیە کە بەستاندارد هەژمار دەکرێن، لەو شێوە چیرۆکانەشدا، بەشی پێناسەی چیرۆك و بەشی وتوێژە کەسایەتییەکانیش لە یەکتری جیادەکرێنەوە، زمانی ستاندارد ڕەنگە لە کۆمەڵی زمانی جۆراوجۆردا شێوەی ڕێچکەی تری هەبێ، کە ئێمە لێرەدا باسی ناکەین، شێوەکانی ئاخاوتن و پەیوەندییان بە یەکترەوە و شێواز و ڕەواج و

---

[1]- سەرچاوەی پێشوو، ل ١٤٧.

[2]- هەمان سەرچاوە، ل ١٤٧.

بەکارهێنانیان پەیوەستە بە ناوەرۆکی ستاندارد و زیاتر هەڵدەگرێ و لە کۆمەڵگایەکەوە بۆ کۆمەڵگایەکی تر ڕەنگە جیاوازبێت[1].

### ٣ ـ ٦ : بابەتە تیۆرییە دیاریکراوەکانی ستانداردکردن

١- بەجیهانی بوونی ئەزموونەکانی ڕۆژئاوا: یەکێك لە پێویستییەکانی تیۆرێکی گشتی بریتییە لە تواناکەی بۆ لێکدانەوەی بەستانداردکردنی زمانە ڕۆژهەلاتی و ڕۆژئاواییەکان. ستانداردکردن، بەو شێوەیەی کەوا پێناسەکراوە، بریتییە لە دیاردەیەکی دوای ڕێنسانسی ئەوروپای ڕۆژئاوا، هەروەها بەکارهێنانییەتی بەشێوەیەکی فراوانی جیهانی، وەکو سیفەتەکانی تری گۆڕانە مێژووییەکانی ڕۆژئاوا. پرۆسەکانی گەشەکردنی زمان بریتین لە[2]: (أ) بەکارهێنانی زمانی ئەدەبی لەناو هەموو بوارەکانی پەیوەندیکردن، تەنانەت زمانی خەڵکی ڕەمەکیش (ب) پێکهێنانی ڕێسایەکی یەکگرتووی لێکسیکی و ڕێزمانی (جـ) تێکۆشان بۆ پڕکردنەوەی ئەو بۆشاییەی کە لەنێوان شێوازی نووسین و نارەسمیدا هەیە (د) تێکەڵبوونی شێوازی شێوەزارەکان، پرۆسەی بەستانداردکردن لەولاتانی تازە پێگەیشتوودا (ئاسیا، ئەفریقیا) وەکو هی ولاتانی ڕۆژئاوای ئەوروپایە، بەلام ئەو پرۆسەیە لە ولاتانی ڕۆژئاوادا خێراتر و ئالۆزترە.

٢- بەمۆدێرنکردنی زمانەوانی و ئابووری ـ کۆمەلایەتی: لێکۆڵینەوە کۆنەکانی بەستانداردکردن هەمیشە سەرنجیان داوەتە لایەنی زمانەوانی، لەکاتێکدا کە هۆکارە نازمانەوانییەکان وەکو (بازرگانی، پیشەسازی، شارستانیەت) زۆر باسیان

---

[1]- هەمان سەرچاوە، ل ١٤٨.

[2]- Guxmam m. m., Some general regularities in the formation and develop ment of national language, Mouton, pp. 768.

لێوەکراوە، وەکو دوو لایەنی (زمانەوانی و کۆمەڵایەتی) هەرگیز بەیەکەوە بیریان لێ نەکراوەتەوە، لەڕوانگەی تیۆرییەوە وەکو دوو دیوی یەك دراون[1].

لەڕووی مێژووییەوە، ئێمە سەیری ستانداردکردن دەکەین وەکو لایەنێکی زمانەوانی یان لایەنێکی گۆڕانکاری کۆمەڵایەتی، ئابووری، کولتووری، سیاسی، کە لە چاخەکانی ناوەڕاستەوە تاکو سەردەمی مۆدێرنیتە لە ڕۆژئاوادا گوازراوەتەوە، ئەو پرۆسەیەش پێی وتراوە بە (ئەورووپی کردن) یان (بە ڕۆژئاوایی کردن)، پاشان پێی وتراوە (بەمۆدێرنیتەکردن)، بەرچاوترین گۆڕانی سیاسی بریتی بوو لە بە دیموکراتیزەکردنی سیستەمی سیاسی، و گۆڕانی کولتوریش بریتی بوو لە گەشەکردنی خوێندەواری، هۆکارەکانی ڕاگەیاندن، پەروەردە، بە تایبەتی دوای شۆڕشی پیشەسازی. گۆڕانی زمانیش بریتی بوو لە میکانیزمی نووسین و، زیادکردنی ناوەندەکانی پەیوەندیکردن بەهۆی چاپەوە، بێگومان داهێنانی چاپی کاغەز لە (چین) نەبووە هۆی پەیدابوونی هۆکارەکانی ڕاگەیاندن لە شوێنی خۆیان، یان لە وڵاتانی دراوسێ[2]. دەرەبەگی کۆمەڵگای ئەورووپی دیار نەما کە بووە هۆی کەمی پەیوەندیکردن، لەبەر ئەوە بەکارهێنانی زمان لە هۆکارەکانی ڕاگەیاندن بەشێوەیەکی فراوان لە نووسین و چاپدا کە پەیوەندی بەستانداردکردنەوە هەیە[3].

٣ـ ستانداردکردن و دروستبوونی نەتەوە: بە مۆدێرنبوونی کۆمەڵگاکانی ڕۆژئاوای ئەورووپا بووە هۆی گواستنەوەی کەمەنەتەوەکان بۆ نەتەوەی جیاواز، وەکو (ئینگلیز، فەڕەنسی، هۆڵەندی، ئەڵمانی، هتد.). گەشەکردنی زمانی خەڵکی ڕەمەکی

---

1- Amir Hassan Pour (1992), Nationalism and Language in Kurdistan, 1918 – 1985, P.H.D., Mellen Research University press, San Francisco, p. 33.

2- Amir Hassan Pour, p. 33 – 34.

3- Amir Hassan Pour, p. 34.

یەك ناوچە بۆ ناو زمانی نەتەوەیی، نیشانەیەکی بەرچاوی ئەو پەرەسەندنەبوو. پەیوەندی نێوان ستانداردکردن و پێشکەوتنی نەتەوایەتی لەسەرەتای ڕێنیسانسەوە هەر هەبووە، بەیەکەوە بوونی زمانی ستاندارد و دروست بوونی نەتەوە لە ڕۆژهەڵاتی ئەورووپا (بەڵقان و ئەسکەندەنافیا) لە نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەیەم شتێکی بەڵگە نەویستە، بەلایەنی کەمەوە چوار بنەمای سەرەکی هەیە، کە پەیوەندی نێوان زمان و بنیاتی کۆمەڵایەتی دەردەخات[1]:

أ ـ زمان لایەنێکی بنەڕەتییە.

ب ـ بنیادی کۆمەڵایەتی بڕیاری یەکلاییکەرەوە دەدات.

جـ ـ ئەو دوانەی پێشوو بەیەکەوەن و جیاناکرێنەوە.

د ـ ئەو دوو لایەنە بەیەکەوە بڕیاریان لەسەر دەدرێت.

ئەو تیۆرانە پەیوەندی نێوان لایەنە زمانەوانی و نازمانەوانییەکانی وەکو (کۆمەڵایەتی، ئابووری، ئایین، سیاسی، کولتوری) لێکدەداتەوە.

٤ـ بەستانداردکردن و پشتیوانی زمان: پرۆسەی ستانداردکردن ڕووبەڕووی (هەڕەشە، لەناوچوون) دەبێتەوە، نەمانی زمانیش دیاردەیەکە لە سەرانسەری جیهاندا بەدی دەکرێت، هەندێك زمان بەهۆی پرۆسەی ستاندارکردن لەجیهاندا تووشی کۆمەڵێك گرفت بوونەتەوە، بەتایبەتی بەهۆی هەوڵەکانی حکومەت بۆ تێکەڵاوبوون و بەکارهێنان. زمانە ڕەسمییەکان هەڕەشە لە زمانە کەمە نەتەوایەتییەکان و زمانی خەڵکی ڕەمەکی دەکەن، ئەوەش بە پشتیوانی دەسەڵاتی دەوڵەت یان هێزی بازاڕ، کەواتە دەرفەتەکانی نەمانی زمان زۆرترن لە دەرفەتەکانی ستانداردکردن.

---

1- Ibid, p. 34.

٥ـ پێوانەکردن: کلۆس (Kloss) دوو بنەمای بۆ پێوانەی گەشەکردنی زمان خستووەتەڕوو، کە بریتین لە پلەی بەکارهێنانی زمانی نووسراو و ماوەی ستانداردکردن. لەدواییدا فێرگسۆن سێ بنەمای بۆ پێوەری گەشەکردنی زمان پێشنیاز کردووە، کە بریتین لە:

١ـ نووسین (بە نووسین کردن)، کە بەکارهێنانێکی ڕێکوپێکی نووسین لە کۆمەڵگای ئاخاوتندا لەخۆ دەگرێت.

٢ـ ستانداردکردن، کە گەشەکردنی پێوەرێك لەخۆ دەگرێت، بۆ ئەوەی بەسەر دیالێکتە هەرێمیی و کۆمەڵایەتییەکان زاڵ بێت.

٣ـ بەمۆدێرنکردن، ئەوەش بەهۆی پەرەپێدانی تێکەڵاوبوون لەگەڵ زمانی ئەو کۆمەڵگایانەی کە مۆدێرن و تێکەڵاوی بازرگانین. بەکارهێنانی داتای زمانە ئەفریقییەکان زۆر ئاسانە بۆ هەوڵدان بۆ تایپۆلۆجیکردنی ستانداردکردن، ئەوەش لەسەر بنچینەی ئەو سێ بنەمایەی سەرەوە کە سیفەتی سەرەکی زمانی ستاندارد‌ن، هەریەکە لەو قۆناغانەی کە هۆگن باسی کردوون، پێوانە دەکرێن و دیاری دەکرێن، بەهۆی گونجانیان بۆ ئاستی پەروەردە (سەرەتایی، ناوەندیی، کۆلێج)، هەردوو قۆناغی (پێش ستاندارد و ستاندارد) لە پەرەپێدانی زماندا ئەوە ڕووندەکرێتەوە لەسەر بنەمای (کۆمەڵایەتی، زمانەوانی، ئەدەبی)[1].

[1]- Amir Hassan Pour, p. 34 – 35.

**٣ ـ ٧ : شێوازەکانی ستانداردکردنی زمان**

ستانداردکردن شێوازی جۆراوجۆر و جیاوازی هەیە، هەر زمانێك شێواز و جۆری ستانداردکردنی تایبەت بەخۆی هەیە، لەم ڕوانگەیەوە ستانداردکردنی هەر زمانێك دیاردەیەکی تایبەتە، لەگەڵ ئەمەش داوا دەردەکەوێت جۆرایەتی ستانداردکردن لەسەر بنەمای ڕەوتی ستانداردکردنی ئەو زمانانەی کە لە پلەیەکی زۆر بالآدان پەسند بکرێت و، پێناسەیەکی سەرەتاییان بۆ دابنرێت کە هاوکاربێت لە شیکاری ستانداردکردنی زمانە میللییە نوێیەکاندا.

بەجۆرێك لێکۆڵینەوە لە ستانداردکردنی زمانانی ئەوروپایی لە ڕێنیسانسەوە بە دواوە، (فێرگسۆن)ی زمانەوان گەیشتبووە ئەو ئەنجامەی کە چەند تایبەتمەندییەکی هاوبەشیان هەیە[1]:ـ

١ـ بنیاتنانی ستاندارد لە ناوەڕاستی شاردا ئەنجامی گفتوگۆی چینێکی ئەکادیمی بووە.

٢ـ نووسەرێك یان چەند نووسەرێك بە ناونیشانی نموونەی جێی متمانەی بەکارهێنانی زمانی ئەدەبی لە حاڵەتی ستانداردکردندا، لە ستانداردکردنەکەدا بەشداربوون.

٣ـ زمان لە حاڵەتی ستانداردکردندا، لە ژێر ناونیشانی ئایینی یان نەتەوەیی ڕۆڵی بینیوە.

٤ـ زمان لە حاڵەتی ستانداردکردنی زمانێکی تر، کە وەکو پێوەرێکی باوەڕپێکراوی نووسین و ڕاگەیاندن سەیردەکرا، لایداوە و خۆی جێگەی گرتووەتەوە.

---

1- Ferguson,C.A.(1988), Language and National Development, Oxford, Oxford University Press, P. 42 – 43.

هەروەها شوێنکەوتوانی (میلرۆی) زمانەوان کۆمەڵێك بۆچوونی سەپاندنیان لە بابەتی ناوەرۆکی زمان و دروستی و نادروستی دەخەنەڕوو و دەیسەپێننە سەر خەڵك، کە بە (ئایدۆلۆژی ستاندارد) ناودەبرێت، کە نموونەی جیاکارین لە ناوەرۆکی ستاندارد و ستانداردکردن و، بەمجۆرەی خوارەوەیە[1]:-

١- بارودۆخی بالأیی زمان، لێکچووی و یەکسانییە، هەموو کەسێك دەبێت بە یەکجۆر قسەبکەن و بنووسن، تەنها یەك جۆر زمان ڕێگەپێدراو و جێی متمانەیە، بەکارهێنان و گۆڕانکاری ناستاندارد هەمووکات تاڕادەیەك نەگونجاوە، گۆڕانکاری زمانی نەگونجاو گرفت دروست دەکات و لەبەر ئەم هۆیە دەبێت پێشی پێبگرین.

٢- بە بڕشترین و جێ متمانەترین و خاوەن بالأترین پێگەی جۆری زمان لە نووسیندایە، لەڕاستیدا ئەو زمانانەی کە جۆری نووسینی خۆیان نییە، لە ڕاستیدا زمان نین، بەڵکو بە شێوەزار و دیالێکتێکی دیاریکراو هەژمار دەکرێن، ئەگەرچی پێوەری پێگەدیار و، لە گفتاردا بوونی نییە، بەلأم بەگشتی ئاخاوتن لە خوار پلەی نووسینی ڕێزمانی هەژمار دەکرێت، نایابترین شێوەی زمان لە نووسینی باشترین نووسەرەکانی کۆمەڵگەیە، بەو جۆرەی کە بایەخە سەپێنراوەکان و جوانناسی و فەرهەنگی دیاریانکردووە، بەرچاودەکەوێت.

٣- شێوەی ستاندارد باشترە لە جۆرەکانی تری زمان، واتا بەرجەستەتر و ڕوونتر و گونجاوترە لە جۆرەکانی تری زمان. جۆری ستاندارد بەگشتی جۆری زمانی ئەو کەسانەیە کە زۆرترین دەسەلأت و بالاترین پێگەیان هەیە، جۆرەکانی تری زمانی بە

---

1- Lodge, R. A. (1993), From Dialect to Standard, Routedge, p. 156 – 157.

لادانێکی بێ بنەما لە ستاندارد هەژمار دەکرێن، ئەوان کۆششی ناتەواون بۆ دەربڕین ، ئەو جۆرانە کەسانێك بەکاری دەهێنن کە لە پلەکانی خوارتردان.

بۆیە بە گشتی دەتوانرێت ستانداردکردن بۆ دوو جۆری سەرەکی دابەشبکرێت:

**١ـ ستانداردکردنی بێپلان:**

مەبەست لە ستانداردکردن بێپلان ئەو ڕەوتە مێژوویی و سروشتییە، کە تیایدا جۆرێك لە زمان لە ژێر کاریگەری هەلومەرجی کۆمەڵایەتی وسیاسیی و ئایینی و ئابووریی کۆمەڵگای زمانی دەگاتە پێگەی ستاندارد. لەم ڕەوتەدا وا ڕێکدەکەوێت کە چالاکی ڕێکخراوەیی بۆ بەکارهێنانی ستاندارد لە بەشە جیاوازەکانی کۆمەڵگە ئەنجام نەدرێت، بەڵکو هۆکاری سیاسی و فەرهەنگی وادەکات خواست و ڕەوایەتی جۆرێك لە زمان گەشەسەندوتر دەکات، بە گرنگی پێدانی نووسەر و هۆزانڤانان و....هتد، ئەو جۆرە زمانە بە تێپەڕاندنی ڕەوتێك پلەیەکی بەرچاو لە ستاندارد بەدەست دەهێنێت[1] بۆ نموونە زمانی عەرەبی بەهۆی فاکتەری ئایینی و زمانی تورکی بەهۆی فاکتەری سیاسی بەجۆری ستانداردکردنی بێپلان هەژمار دەکرێن[2].

زۆرینەی زمانە ستانداردەکانی جیهان بەمجۆرە ستانداردکردن کراون. دەبێت ئەوە لەبەرچاو بگرین، کە لە ستانداردکردنی پلان بۆ دانەڕێژراودا چالاکی مەبەستدار کە پێشتر بیری لێکراوەتەوە لەوانەیە ئەنجام بدرێت، ئەم چالاکیانە بەگشتی هی سەردەمی ئێستایە و زۆرتر بەستراوەتەوە بە قۆناغەکانی پێشتری ستانداردکردنە، لەوانە کۆکردنەوە و چەسپاندن، بەڵام قۆناغی زۆر سەختی هەڵبژاردنی پێوەرە

---

[1]- ناصر قلی سارلی، هەمان سەرچاوە، ل ١٦١.

[2]- لە بەشی دووەمدا بە درێژی ئەم حاڵەتەمان خستۆتەڕوو.

باوەڕپێکراوەکان بەگشتی خۆنەویستانە ئەنجام دەدرێت، ئەم هەڵبژاردنەش بە هەلومەرجی سیاسی و کۆمەڵایەتیەوە بەستراوەتەوە[1].

**٢ـ ستانداردکردنی بەپلان:**

شێوازێکی تری ستانداردکردن کە هی سەردەمی نوێیە، ستانداردکردنی بەپلان، ئەمجۆرە ستانداردکردنە، بە جۆرێك لە پلانڕێژی زمان هەژماردەکرێت، کە کۆمەڵێك چالاکی مەبەستدار و بە پلان دەگرێتەخۆ. لەمجۆرە ستانداردکردنەدا وڵاتەکان، حکومەتەکان یان دامەزراوەیەك جۆرێکی زمان بە زمانی ستاندارد هەڵدەبژێرێت، بە بەرنامە بۆ داڕشتنێك ئەو زمانە یان شێوەزارە دەگەیەنێتە پلەی ستاندارد. لەمجۆرە ستانداردکردنەدا هەندێك دامەزراوە وەکو کۆڕی زانیاری و ڕێکخراوی پەیوەندیدار بە زمان کاری لەسەر دەکەن، لەمجۆرەشدا هۆکار و بڕیارە سیاسی و کۆمەڵایەتییەکان کاریگەری دەخەنە سەر ستانداردکردنی زمان، بەگشتی ئەو دامەزراوانە لە سیاسەتی کاری خۆیان ئەو هەلومەرجە لەبەر چاو دەگرن، لەمجۆرە ستانداردکردنەدا هەندێك جار بەرژەوەندی زمان و سیاسی و ئایینی و کۆمەڵایەتی ستاندارد ناچاردەکات بڕیاری سەرسوڕهێنەر بدەن، بۆ نموونە هەڵبژاردنی زمانی عیبری کلاسیك بە ناونیشانی زمانی ستاندارد و بەرزکردنەوەی پلەی ئەو زمانە بۆ جۆرێکی زمانی کارا و گونجاو بۆ ژیانی ڕۆژانە، سەیر لەوەدایە کە لەکاتی هەڵبژاردنی ئەم زمانە هیچ کەسێك بە عیبری کلاسیك قسەی نەدەکرد و ئەمجۆرە زمانە تەنها لە نووسراوە پیرۆزەکانی یەهودییەکان بوونی هەبوو[2].

---

[1]- ناصری قلی سارلی، ل ١٦١ – ١٦٢.

[2]- سەرچاوەی پێشوو، ل ١٦٢.

پلانی زمانیش یاخود ئەندازەی زمان ، هەوڵێکی ورد و سیستیماتیکی و لەسەر تیۆر دامەزراوە، بۆ چارەسەرکردنی کێشەکانی پەیوەندیکردنی کۆمەڵگایەکی (فرەزمانی) یاخود (تاکزمانی)یە. ئەو سیاسەتەی زمان هەوڵدەدات لەناو هەموو دیالێکتەکانی زمانێك (کۆمەڵگای تاکزمانی) یان زمانەکانی کۆمەڵگایەکی فرەزمانی، دیالێکتێك بۆ تاکەکانی نەتەوەیەك بکاتە زمانی ستاندارد یان زمانی فەرمی وڵات، لە هەمان کاتیشدا لەناو کۆمەڵگای فرەنەتەوەش زمانێك هەڵدەبژێرێ، کە ببێتە زمانی فەرمی وڵات.[1] واتە زمانی ستاندارد لە ئەنجامی پلاندانانی شارەزایانی نەتەوەیەك یان ئێتنیکێکی دیاریکراودا پەیدا دەبێت[2].

هەر جۆرە زمانێك بۆ تێپەڕبوون لە شێوەزار بۆ زمان و لە زمانی ناوچەییەوە بۆ زمانی ستاندادر، دەبێت چەند قۆناغێك ببڕێت، زمانناسان قۆناغی زۆر و هەندێك جار جیاوازیان باسکردووە، بۆ بەرەوپێش چوون و فراوانی زمان، هەندێك لە دابەشکردنی قۆناغەکانی ستانداردکردن بە قۆناغی جیاواز، دیدێکی گشتگیریان هەیە و هەندێکی تر ڕوانگەیەکی بەش بەشکردنیان هەیە. بۆیە لێرەدا هەندێ لە شێوازەکانی ستانداردکردنی پلاندارێژراو لای زمانەوانان دەخەینەڕوو:

### ١ـ شێوازی هۆگن (Hougen)

بایەخدارترین بیرۆکە سەبارەت بە قۆناغی ستانداردکردن لە لایەن (ئینار هۆگن)ی نەرویجی دارێژراوە، بڕوای ئەو لەو ڕوانگەیەوە جێگەی گرنگی پێدانە، کە ئەو لێکۆڵینەوەی زۆری لەسەر ستانداردکردنی وڵاتانی ئەسکەندەنافیا ئەنجام داوە و نموونەکەی خۆی لەسەر بنەمای بینین و لێکۆڵینەوەی زانستی بنیات ناوە[3].

---

[1]- سەلام ناوخۆش و نەریمان خۆشناو و ئیدریس عەبدوڵڵا (٢٠١٠)؛ کوردۆلۆجی؛ ل٨٧.

[2]- غازی عەلی (٢٠٠٦)، پرۆژەی ستانداردکردنی زمانی کوردی، ل ٢٣٥.

[3]- ناصر قلی سارلی، ل ٢١١.

ئینار هۆگن لە وتارەکەیدا (دیالێکت، زمان، نەتەوە)، کە لەساڵی ١٩٦٦ بڵاوی کردەوە، شێوازی ستانداردکردنی زمانی باسکردووە، ئەمەش بەشێوەیەکی گشتی پەسندکراوە، دواتر لە ساڵی ١٩٨٣ بە شێوازی پلانی زماندا چووەتەوە، بێ ئەوەی هیچ شتێك بدۆزێتەوە کە پێویست بەگۆڕینی لایەنە بنچینەییەکانی ئەو پلانە بکات[1]. واتە شێوازەکەی هەر وەك ساڵی ١٩٦٦ کە دایینابوو، وەك خۆی ماوەتەوە و، تا ئێستاشی لەگەڵدابی هەر ئەکتیڤە و کاری پێ دەکرێت.

بەگوێرەی شێوازەکەی هۆگن، گۆڕانی دیالێکتێك بۆ زمان پەیوەندییەکی نزیکی هەیە بە پرۆسەی ڕێکخستنی ڕێساکان و پێشکەوتنی ناسیۆنالیزم،[2]واتە زمانی ستاندارد دوای چەند هەنگاوێکی یەك لەدوای یەك دروست دەبێت.[3] بەجۆرێك (هۆگن) بۆ ستانداركردنی زمان چوار هەنگاوی یەك لەدوای یەکی داناوە:-

١- قۆناغی هەڵبژاردنی پێوەر

٢- قۆناغی کۆکردنەوە و بەیاسایی کردنی.

٣- قۆناغی گەشەپێدانی ڕۆڵ و کارکردنەکانی

٤- پەسەند کردنی لەلایەن کۆمەڵگاوە[4]

بە بڕوای (ئینار هۆگن) دوو قۆناغی یەکەم، بەگشتی پەیوەندیدارە بە شێوەی زمان و دوو قۆناغی دووەم پەیوەندیدارە بە ڕۆڵ و کارکردنەکانی. قۆناغی یەکەم و

---

1- Amir Hassan Pour, p. 30.
2- Ali Mahmood jukil, p. 12.
3- غازی عەلی، هەمان سەرچاوە، ل ٢٣٥.
4- Haugen, E. (1966), Dialect, Language, Nation, American Anthropologist, Vol. 68 , No. 6, p. 933.

چوارەم پەیوەندیدارە بە کۆمەڵگەوە و دوو قۆناغی دووەم و سێیەم پەیوەندیدارە بەخودی زمانەوە[١].

## ٢- شێوازی ڕای (Ray)

بە بڕوای (ڕای) چالاکی ستانداردکردن لە دوو قۆناغ پێکهاتووە[٢]:

١- لە قۆناغی یەکەمدا نموونەیەك بۆ لاسایی کردنەوە دروست دەکرێت.

٢- لە قۆناغی دووەمدا ئەو نموونەیە لەبەرانبەر نموونە ڕکابەرەکاندا پەرەی پێدەدرێت و بڵاودەکرێتەوە.

مەبەست لە دروست کردنی نموونەیەك بۆ لاسایی کردنەوە کۆمەڵە پێوەرێکی زمانەوانییە، کە دەتوانێت حەزی بەکارهێنان لای خوێنەر و بیسەر دروست بکات، نموونەی مەبەست خۆی دوو شێوەی گوتن و نووسینی هەیە، سەبارەت بە نموونەکانی گوتن خەڵکی بەهۆی خوو پێوەگرتن و لەبەردەست بوونیان بەکاری دەهێنن، سەبارەت بە نموونەکانی نووسین، بوونی ئەدەبیاتێك پێویستە[٣].

## ٣- شێوازی ڕۆبێرت هال (Hall)

ڕۆبێرت هال سێ قۆناغی بۆ ستانداردکردن داناوە[٤]:

١- هەڵبژاردنی جۆرێك زمان کە لەوانی تر پەسەندتر بزانرێت.

٢- دیاریکردنی سنوری چالاکی مرۆڤ، کە ئەوجۆرە زمانەی ئەوان بەکاری بهێنن.

٣- ناساندنی ئەو جۆرە زمانە لەلایەن خەڵکەوە بە ناونیشانی زمانی ستانداردی نوێ.

---

1- Haugen, E. (1966), Dialect, p. 933.

2- ناصری قلی سارلی؛ ل ٦٢.

3- Ray, P. S. (1986), Language Standardization, Mouton, P. 759.

4-R. A. Hall (1972), pidgins and creoles as Standard Languages, Britain, p. 144.

قۆناغەکانی (هال) زیاتر پەیوەندی بە لایەنی کۆمەڵایەتییەوە هەیە و (هال) گرنگی نەداوە بە ڕەوتی ئەنجامەکانی گۆڕانکارییە پەیوەندیدارەکانی ستانداردکردن، کە هەڵبژاردنی ستاندارد و پەسندکردنی لەلایەن خەڵکەوە ڕەوت و بەدەستهاتووەیەکی تەواو کۆمەڵایەتییە، بەکاربردنی ستاندارد لە سنوری چالاکی مرۆڤانەدا لەگەڵ ئەوەدا کە بە جۆرێك لە گۆڕانکاری زمانەوانی هەژمار دەکرێت، بەروونی دیارە کە کارێکی کۆمەڵایەتییە[1].

## ٤ـ شێوازی هدسن (Hudson)

هدسن بە هەمان شێوەی هۆگن، چوار قۆناغی بۆ ستانداردکردنی زمان دیاریکردووە، کە پێی وایە هەر زمانێك بۆ ئەوەی بگاتە ئاستی ستانداردبوون، دەبێ چوار قۆناغ تێپەڕ بکات، کە بەمشێوەیە:ـ

قۆناغی یەکەم: ئەو شێوە زمانەی کە هەڵدەبژێردرێت و دەبێتە ستاندارد بەهۆی کۆمەڵێ هۆکار کە زۆرتر سیاسیی و کۆمەڵایەتین.

قۆناغی دووەم: لەم قۆناغەدا گەلاڵەداڕێژانی زمانەکە بە کۆکردنەوەی وشە، نووسینی ڕێزمان، ڕێنووس و فۆنەتیکی ئەو شێوە زمانە، سەقامگیری دەکەن.

قۆناغی سێیەم: لەم قۆناغەدا زمانەکە دەبێتە زمانی فەرمانگە و قوتابخانە و دامودەزگای یاسایی و ڕۆشنبیری، واتە لەم قۆناغەدا زمان لە بواری پێکهاتە و شێواز و وشەوە بەرەو دەوڵەمەندبوونەوەی زۆرتر دەچێت و پەرەدەستێنێت.

---

1- ناصر قلی سارلی، ل ٢١١.

قۆناغی چوارەم: لەم قۆناغەدا، قۆناغی پەسندکردنی ئەم شێوە زمانەیە لەلایەن خەڵکەوە، شێوە زمانێك ئەگەر لەلایەن زۆرینەی جەماوەرەوە وەکو پێوەر پەسند نەکرێت، ئەوا ناتوانێت ببێتە زمانی ستاندارد[١].

## ٥- شێوازی میلرۆی (Milroy)

میلرۆی دوو قۆناغ بۆ قۆناغەکانی ئینار هۆگن زیاد کردووە، بە بڕوای ئەو ستانداردکردن ئەو قۆناغانە دەبڕێت[٢]:

١- هەڵبژاردنی جۆرێك بۆ ستاندارد

٢- پەسندکردنی جۆری هەڵبژێردراو لەلایەن خەڵکەوە

٣- گەشەپێدانی و بڵاوکردنەوەی جوگرافییانە و کۆمەڵایەتییانەی جۆرەکە

٤- کۆکردنەوە (بەیاسایی کردن) و جێگیرکردنی ستاندارد

٥- پارێزگاری و چاککردنەوەی ستاندارد

٦- گەشەپێدانی ڕۆڵ و کارکردنی ستاندارد.

هاوبیرانی ملیروی بەشێك لەچالاکییەکانی پەسندکردنی ستاندارد و فراوانکردنی ڕۆڵ و کارکردنی بە بەشێکی جیاوازیان لەقەڵەمداوە، بەڵام گرنگترین خاڵی دابەشکردنەکەی ئەوان، ئاماژەکردنە بە قۆناغی پارێزگاری و نوێکردنەوەی ستاندارد، کە (ئینار هۆگن) ئاماژەی پێنەدابوو، چونکە ستانداردکردنی زمان ڕەوتێکی ئەنجامگیری مێژووییە، کە هیچکات تەواو نابێت، هەر کە هەڵبژاردنی پێوەرەکانی ستاندارد و پەسندکردنی لەلایەن خەڵکەوە دەست پێدەکات، ئیتر بۆ

---

[1]- Hudson, R. A. (1980), Sociolinguistics, Cambridge University press, Cambridge, p, 34.

[2]- Milroy, J. and Milroy(1985), Authority in Language, London, p. 27.

پاراستنی ستاندارد لە پێگەی باڵای خۆی کێشمەکێشمێکی بەردەوام دەست پێدەکات، لەهەر کۆمەڵگەیەکی زمانەوانی، فشار و هێزێك بوونی هەیە کە هەوڵ بۆ پاراستنی ستاندارد دەدات، لەبەرانبەردا هێزێکی دژی بوونی هەیە، کە ڕێگری دەکات لە سەپانی ستاندارد بەسەر زمانی کۆمەڵگەدا(١).

## ٦ـ شێوازی بارچ (Bartsch)

بارچ لەو باوەڕەدایە کە ستانداردکردنی زمان بە دوو شێوە دەستەبەر دەبێت، کە بەمشێوەیە:ـ

قۆناغی یەکەم:ـ لەنێو شێوەزار و دیالێکتەکانی زماندا، یەکێکیان بەهۆی پاڵپشت و ژێرخانی فەرهەنگیی، مێژوویی، ئەدەبی و... وەکو پێوەر پەسند دەکرێت، ئەمجۆرە پەسندکردنە شێوەی سروشتی ستانداردبوونی زمانە.

قۆناغی دووەم:ـ هەڵبژاردنی شێوەزارێك و ستانداردکردنی لەلایەن دامودەزگای تایبەتی گەڵاڵەداڕێژی زمان بۆ ماوەیەکی کورت دەبێت(٢).

هەروەها (بارچ) داکۆکی لەسەر ئەوەش دەکات، کە ئەو شێوە زمانە بۆ ئەوەی ببێتە زمانی ستاندارد، دەبێ ئەم تایبەتمەندییانەی هەبێت:ـ

١ـ گرووپێکی سیاسیی، ئابووریی و خوێندەوار بەکاری بێنن.

٢ـ ئەو شێوە زمانە خاوەنی مێژوویێکی ئەدەبیی و خاوەن نووسەری گەورە بێت.

٣ـ لە هەرێمێکی جوگرافیدا باوی هەبێت(٣).

---

[1]- سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٧.

[2]- Bartsch, Renate(1987), Norms of Language, Longman, London, P. 250.

[3]- Bartsch, (1987), p 251.

## ٧ـ شێوازی گارڤین (Garvin)

شێوازەکەی گارڤین لەسەر ستانداردکردن، لەسەر دوو جۆری پێکهاتەیی بنیات نراوە[1]:

١ـ سەقامگیری نەرم

بەگوێرەی بۆچوونی گارڤین، زمانی ستاندارد دەبێت نموونە گونجاوەکانی نەرم و سەقامگیر بێ، تاوەکو ئەرکی خۆی بەشێوەیەکی ئاسایی جێبەجێ بکات و، ڕێگا بە پەیوەندییە نوێیەکان بدات و وەڵامدانەوەیەك بێت بۆ گۆڕانە کلتورییەکان کە لە ئاخاوتنی کۆمەڵگا ڕوودەدات، ئەو تایبەتمەندییە دەکرێ بەدەست بێ، کاتێك زمانەکە یاسا و توانای وای هەبێت کە بتوانێت جێگای ئەو یاسایانە بکاتەوە کە تازە پۆلێنکراوە و هاتوونەتە ناو ڕێسای زمانەکەوە، بەتایبەت کاتێك ڕووبەڕووی هەلومەرجی گۆڕانکاری دەبێتەوە، ئەم گۆڕانانە بە هەنگاوی خێرا ڕوونادەن، بەڵکو بە تێپەڕبوونی کات ڕوودەدات.

٢ـ ڕووناکبیرییەتی:

دەکرێت ڕووناکبیریەتی زمانی ستاندارد وا لێك بدرێتەوە، کە پەیرەوکردنی ئامانجێکە کەوا لە زمانەکە بکات، چڕو بەهێز بێت، ئەگەر پێویستیش بێت، دەستەواژە و دەربڕینەکانی پوخت بن، ئەم گۆڕانکارییە لە زماندا بەشێوەیەکی سەرەکی کاردەکاتە سەر پێکهاتەی وشەسازی و لایەنەکانی تری ڕێزمان.

---

[1] - عەلی مەحموود جوکل(٢٠١١)، هەمان سەرچاوە، ل ١٢٢ – ١٢٣.

## ٣ـ ٨ : قۆناغەکانی ستانداردکردنی زمان

### ١ـ هەڵبژاردنی پێوەرێك

هەمیشە شێوەزارێك بۆ ستانداردکردن هەڵدەبژێردرێ یان لەوانەیە ببێتە زمانی ناوەندێکی گرنگ یان ببێتە تێکەڵەی چەند شێوەزارێکی هەمەجۆر[1]. هەڵبژاردنی پێوەرێکیش ڕەنگە ئەستەم بێ، چونکە بەشێوەیەکی گشتیی ئەمە پشت بە هەڵوێستی ئاخاوتنی کۆمەڵگا دەبەستێ، ئاخۆ بەسەر ئەم زەحمەتییە زاڵ دەبن لە هەڵبژاردنی پێوەرێك یان تەنانەت لەبەرانبەر زەحمەتییەکی کەمیش ملکەچ دەبن (چۆك دادەدەن).[2]

لێرەدا پایەی دیالێکتێك یان شێوەزارێك، چ لەلایەنی کۆمەڵایەتی، یان هەژموونی ئایینی یاخود سیاسیی، زۆر گرنگە لە پرۆسەی هەڵبژاردن و دیاریکردنی دیالێکتێك لەنێو دیالێکتەکانی زمانێك، بێگومان ئەم هەڵبژاردنە ڕەمەکی نابێ، بەڵکو دەبێت کەسانی زمانەوان و پسپۆڕ لەبواری زمانەوە ئەنجامی بدەن. هەرچەندە ئەم پرۆسەیە زمانەوانییە، بەلام زۆرجار دەسەلاتی سیاسی ڕۆڵی خۆی دەبینێ لە سەپاندنی دیالێکتێك بەسەر دیالێکتەکانی تردا[3].

خاڵێکی تری گرنگ لێرەدا ئەوەیە، دەبێ تەنها دیالێکتێك یان (شێوەزارێك) و تەنها (ئەلفوبێیەك) هەڵبژێردرێ، بۆ ئەوەی تووشی دابەشکردن و پارچە

---

[1]- Hudson R. A.(1980), Sociolinguistics. Cambridge University press, 1980, P. 33.

[2]-Wardhaugh, R. (1986), An Introduction to Sociolinguistics, Great Britain, p. 31.

[3]- سەلام ناوخۆش و نەریمان خۆشناو، کوردۆلۆجی، ل ٨٧ — ٨٨.

پارچەکردن نەبێت.[1] واتە لە توخمی هەڵبژاردندا دیالێکتێك هەڵدەبژێردرێت بۆ ئەوەی ببێتە بنچینە بۆ زمانی ستاندارد[2].

کەواتە لێرەدا گەرەکە دیالێکتێك دەست نیشان بکەین و هەڵیبژێرین، ئەم هەڵبژاردنەش پەیوەستە بە کۆمەڵێ خاسیەت و تایبەتمەندی، لەوانە:ـ

١ـ دیالێکتەکە لە بواری نووسین و ئاخاوتندا خزمەتکرابێ.

٢ـ دیالێکتەکە لە ڕووی فەرهەنگی وشەوە دەوڵەمەندبێ.

٣ـ لەلایەن زۆربەی کۆمەڵانی خەڵکی کۆمەڵگاکەوە ئاشنابێت.

پێگەی جۆرە شێوەزارە هەڵبژێردراوەکە گەشەدەکات و شێوەزارەکانی تر لە ڕوانگەی زمانەوانییەوە بچووك دەبنەوە، هەڵبژاردن و جێگیرکردنی پێوەری زمانەوانی ڕەوتێکی ئاڵۆزە، کە پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆی بە پێکهاتەی زمان و کۆمەڵگەوە هەیە و کاتێك هەموو خەڵکی وەکو یەك قسە بکەن، ئەو گرفتێکی ئەوتۆ نامێنێتەوە، ئەگەر وانەبێت لەوانەیە ناچاربین بڕیاری ئازاردەر دەربکەین، هەڵبژاردنی هەر زمانێکی ڕەسەن بە زمانی ستاندارد، بەمانای پشتگیری کردن لەو خەڵکە دێت، کە بەو زمانە قسەدەکەن، ئەمەش بەها دەدات بەوان، لەبەرئەوەی پێوەرەکە هی ئەوانە، لە پێشبڕکێی بەدەست هێنانی دەسەڵات ئەو بابەتە وەکو خاڵێکی بەهێز بۆ ئەوان بەکاردێت[3].

دەبێ لێرەدا باسی خاڵێکی گرنگ بکەین، ئەویش ئەوەیە، کە پاڵنەرە سیاسیی و ئایینی و مەزهەبییەکان هەندێك جار ستانداردسازان ناچاردەکەن، بڕیاری سەیر دەربکەن، تەنانەت لەوانەیە زمانێکی لەنێوچوو بهێننەوە گۆڕێ، ستانداردکردنی

---

1- هەمان سەرچاوە، ل ٨٨.

2- غازی عەلی، هەمان سەرچاوە، ل ٢٣٥.

3- ناصر قلی سارلی، ل ٢٢٠.

ئینار هۆگن لە وتارەکەیدا (دیالێکت، زمان، نەتەوە)، کە لەساڵی ١٩٦٦ بڵاوی کردەوە، شێوازی ستانداردکردنی زمانی باسکردووە، ئەمەش بەشێوەیەکی گشتی پەسندکراوە، دواتر لە ساڵی ١٩٨٣ بە شێوازی پلانی زماندا چووەتەوە، بێ ئەوەی هیچ شتێك بدۆزێتەوە کە پێویست بەگۆڕینی لایەنە بنچینەییەکانی ئەو پلانە بکات[1]. واتە شێوازەکەی هەر وەك ساڵی ١٩٦٦ کە داینابوو، وەك خۆی ماوەتەوە و، تا ئێستاشی لەگەڵدابی هەر ئەکتیڤە و کاری پێ دەکرێت.

بەگوێرەی شێوازەکەی هۆگن، گۆڕانی دیالێکتێك بۆ زمان پەیوەندییەکی نزیکی هەیە بە پرۆسەی ڕێکخستنی ڕێساکان و پێشکەوتنی ناسیۆنالیزم،[2] واتە زمانی ستاندارد دوای چەند هەنگاوێکی یەك لەدوای یەك دروست دەبێت.[3] بەجۆرێك (هۆگن) بۆ ستانداردکردنی زمان چوار هەنگاوی یەك لەدوای یەکی داناوە:ـ

١ـ قۆناغی هەڵبژاردنی پێوەر

٢ـ قۆناغی کۆکردنەوە و بەیاسایی کردنی.

٣ـ قۆناغی گەشەپێدانی ڕۆڵ و کارکردنەکانی

٤ـ پەسەند کردنی لەلایەن کۆمەڵگاوە[4]

بە بڕوای (ئینار هۆگن) دوو قۆناغی یەکەم، بەگشتی پەیوەندیدارە بە شێوەی زمان و دوو قۆناغی دووەم پەیوەندیدارە بە ڕۆڵ و کارکردنەکانی. قۆناغی یەکەم و

---

[1]- Amir Hassan Pour, p. 30.
[2]- Ali Mahmood jukil, p. 12.
[3]- غازی عەلی، هەمان سەرچاوە، ل ٢٣٥.
[4]- Haugen, E. (1966), Dialect, Language, Nation, American Anthropologist, Vol. 68 , No. 6, p. 933.

چوارەم پەیوەندیدارە بە کۆمەڵگەوە و دوو قۆناغی دووەم و سێیەم پەیوەندیدارە بەخودی زمانەوە[١].

**٢- شێوازی ڕای (Ray)**

بە بڕوای (ڕای) چالاکی ستانداردکردن لە دوو قۆناغ پێکهاتووە[٢]:

١- لە قۆناغی یەکەمدا نموونەیەك بۆ لاسایی کردنەوە دروست دەکرێت.

٢- لە قۆناغی دووەمدا ئەو نموونەیە لەبەرانبەر نموونە ڕکابەرەکاندا پەرەی پێدەدرێت و بلاودەکرێتەوە.

مەبەست لە دروست کردنی نموونەیەك بۆ لاسایی کردنەوە کۆمەڵە پێوەرێکی زمانەوانییە، کە دەتوانێت حەزی بەکارهێنان لای خوێنەر و بیسەر دروست بکات، نموونەی مەبەست خۆی دوو شێوەی گوتن و نووسینی هەیە، سەبارەت بە نموونەکانی گوتن خەڵکی بەهۆی خوو پێوەگرتن و لەبەردەست بوونیان بەکاری دەهێنن، سەبارەت بە نموونەکانی نووسین، بوونی ئەدەبیاتێك پێویستە[٣].

**٣- شێوازی ڕۆبێرت هال (Hall)**

ڕۆبێرت هال سێ قۆناغی بۆ ستانداردکردن داناوە[٤]:

١- هەڵبژاردنی جۆرێك زمان کە لەوانی تر پەسەندتر بزانرێت.

٢- دیاریکردنی سنوری چالاکی مرۆڤ، کە ئەوجۆرە زمانەی ئەوان بەکاری بهێنن.

٣- ناساندنی ئەو جۆرە زمانە لەلایەن خەڵکەوە بە ناونیشانی زمانی ستانداردی نوێ.

---

1- Haugen, E. (1966), Dialect, p. 933.

2- ناصری قلی سارلی، ل ٦٢.

3- Ray, P. S. (1986), Language Standardization, Mouton, P. 759.

4-R. A. Hall (1972), pidgins and creoles as Standard Languages, Britain, p. 144.

قۆناغەکانی (هال) زیاتر پەیوەندی بە لایەنی کۆمەڵایەتییەوە هەیە و (هال) گرنگی نەداوە بە ڕەوتی ئەنجامەکانی گۆڕانکارییە پەیوەندیدارەکانی ستانداردکردن، کە هەڵبژاردنی ستاندارد و پەسندکردنی لەلایەن خەڵکەوە ڕەوت و بەدەستهاتووەیەکی تەواو کۆمەڵایەتییە، بەکاربردنی ستاندارد لە سنوری چالاکی مرۆڤانەدا لەگەڵ ئەوەدا کە بە جۆرێك لە گۆڕانکاری زمانەوانی هەژمار دەکرێت، بەروونی دیارە کە کارێکی کۆمەڵایەتییە[1].

## ٤ـ شێوازی هدسن (Hudson)

هدسن بە هەمان شێوەی هۆگن، چوار قۆناغی بۆ ستانداردکردنی زمان دیاریکردووە، کە پێی وایە هەر زمانێك بۆ ئەوەی بگاتە ئاستی ستانداردبوون، دەبێ چوار قۆناغ تێپەڕ بکات، کە بەمشێوەیە:-

قۆناغی یەکەم: ئەو شێوە زمانەی کە هەڵدەبژێردرێت و دەبێتە ستاندارد بەهۆی کۆمەڵێ هۆکار کە زۆرتر سیاسیی و کۆمەڵایەتین.

قۆناغی دووەم: لەم قۆناغەدا گەڵاڵەدارێژانی زمانەکە بە کۆکردنەوەی وشە، نووسینی ڕێزمان، ڕێنووس و فۆنەتیکی ئەو شێوە زمانە، سەقامگیری دەکەن.

قۆناغی سێیەم: لەم قۆناغەدا زمانەکە دەبێتە زمانی فەرمانگە و قوتابخانە و دامودەزگای یاسایی و ڕۆشنبیری، واتە لەم قۆناغەدا زمان لە بواری پێکهاتە و شێواز و وشەوە بەرەو دەوڵەمەندبوونەوەی زۆرتر دەچێت و پەرەدەستێنێت.

---

[1]- ناصر قلی سارلی، ل ٢١١.

قۆناغی چوارەم: لەم قۆناغەدا، قۆناغی پەسندکردنی ئەم شێوە زمانەیە لەلایەن خەڵکەوە، شێوە زمانێك ئەگەر لەلایەن زۆرینەی جەماوەرەوە وەکو پێوەر پەسند نەکرێت، ئەوا ناتوانێت ببێتە زمانی ستاندارد[1].

### ٥- شێوازی میلرۆی (Milroy)

میلرۆی دوو قۆناغ بۆ قۆناغەکانی ئینار هۆگن زیاد کردووە، بە بڕوای ئەو ستانداردکردن ئەو قۆناغانە دەبڕێت[2]:

١- هەڵبژاردنی جۆرێك بۆ ستاندارد

٢- پەسندکردنی جۆری هەڵبژێردراو لەلایەن خەڵکەوە

٣- گەشەپێدانی و بڵاوکردنەوەی جوگرافییانە و کۆمەڵایەتییانەی جۆرەکە

٤- کۆکردنەوە (بەیاسایی کردن) و جێگیرکردنی ستاندارد

٥- پارێزگاری و چاککردنەوەی ستاندارد

٦- گەشەپێدانی ڕۆڵ و کارکردنی ستاندارد.

هاوبیرانی ملیروی بەشێك لەچالاکییەکانی پەسندکردنی ستاندارد و فراوانکردنی ڕۆڵ و کارکردنی بە بەشێکی جیاوازیان لەقەڵەمداوە، بەڵام گرنگترین خاڵی دابەشکردنەکەی ئەوان، ئاماژەکردنە بە قۆناغی پارێزگاری و نوێکردنەوەی ستاندارد، کە (ئینار هۆگن) ئاماژەی پێنەدابوو، چونکە ستانداردکردنی زمان ڕەوتێکی ئەنجامگیری مێژووییە، کە هیچکات تەواو نابێت، هەر کە هەڵبژاردنی پێوەرەکانی ستاندارد و پەسندکردنی لەلایەن خەڵکەوە دەست پێدەکات، ئیتر بۆ

---

1- Hudson, R. A. (1980), Sociolinguistics, Cambridge University press, Cambridge, p, 34.

2- Milroy, J. and Milroy(1985), Authority in Language, London, p. 27.

پاراستنی ستاندارد لە پێگەی باڵای خۆی کێشمەکێشمێکی بەردەوام دەست پێدەکات، لەهەر کۆمەڵگەیەکی زمانەوانی، فشار و هێزێك بوونی هەیە کە هەوڵ بۆ پاراستنی ستاندارد دەدات، لەبەرانبەردا هێزێکی دژی بوونی هەیە، کە ڕێگری دەکات لە سەپانی ستاندارد بەسەر زمانی کۆمەڵگەدا[1].

## ٦ـ شێوازی بارچ (Bartsch)

بارچ لەو باوەڕەدایە کە ستانداردکردنی زمان بە دوو شێوە دەستەبەر دەبێت، کە بەمشێوەیە:ـ

قۆناغی یەکەم:ـ لەنێو شێوەزار و دیالێکتەکانی زماندا، یەکێکیان بەهۆی پاڵپشت و ژێرخانی فەرهەنگیی، مێژوویی، ئەدەبی و... وەکو پێوەر پەسند دەکرێت، ئەمجۆرە پەسندکردنە شێوەی سروشتی ستانداردبوونی زمانە.

قۆناغی دووەم:ـ هەڵبژاردنی شێوەزارێك و ستانداردکردنی لەلایەن دامودەزگای تایبەتی گەڵاڵەداڕێژی زمان بۆ ماوەیەکی کورت دەبێت[2].

هەروەها (بارچ) داکۆکی لەسەر ئەوەش دەکات، کە ئەو شێوە زمانە بۆ ئەوەی ببێتە زمانی ستاندارد، دەبێ ئەم تایبەتمەندییانەی هەبێت:ـ

١ـ گرووپێکی سیاسیی، ئابووریی و خوێندەوار بەکاری بێنن.

٢ـ ئەو شێوە زمانە خاوەنی مێژوویێکی ئەدەبیی و خاوەن نووسەری گەورە بێت.

٣ـ لە هەرێمێکی جوگرافیدا باوی هەبێت[3].

---

1- سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٧.

2- Bartsch, Renate(1987), Norms of Language, Longman, London, P. 250.

3- Bartsch, (1987), p 251.

## ٧- شێوازی گارڤین (Garvin)

شێوازەکەی گارڤین لەسەر ستانداردکردن، لەسەر دوو جۆری پێکهاتەیی بنیات نراوە[1]:

١- سەقامگیری نەرم

بەگوێرەی بۆچوونی گارڤین، زمانی ستاندارد دەبێت نموونە گونجاوەکانی نەرم و سەقامگیر بێ، تاوەکو ئەرکی خۆی بەشێوەیەکی ئاسایی جێبەجێ بکات و، ڕێگا بە پەیوەندییە نوێیەکان بدات و وەلامدانەوەیەك بێت بۆ گۆڕانە کلتورییەکان کە لە ئاخاوتنی کۆمەلگا ڕوودەدات، ئەو تایبەتمەندییە دەکرێ بەدەست بێ، کاتێك زمانەکە یاسا و توانای وای هەبێت کە بتوانێت جێگای ئەو یاسایانە بکاتەوە کە تازە پۆلێنکراوە و هاتوونەتە ناو ڕێسای زمانەکەوە، بەتایبەت کاتێك ڕووبەڕووی هەلومەرجی گۆڕانکاری دەبێتەوە، ئەم گۆڕانانە بە هەنگاوی خێرا ڕوونادەن، بەلکو بە تێپەڕبوونی کات ڕوودەدات.

٢- ڕووناکبیرییەتی:

دەکرێت ڕووناکبیریەتی زمانی ستاندارد وا لێك بدرێتەوە، کە پەیڕەوکردنی ئامانجێکە کەوا لە زمانەکە بکات، چڕو بەهێز بێت، ئەگەر پێویستیش بێت، دەستەواژە و دەربڕینەکانی پوخت بن، ئەم گۆڕانکارییە لە زماندا بەشێوەیەکی سەرەکی کاردەکاتە سەر پێکهاتەی وشەسازی و لایەنەکانی تری ڕێزمان.

---

[1]- عەلی مەحموود جوکل(٢٠١١)، هەمان سەرچاوە، ل ١٢٢ — ١٢٣.

## ٣ـ ٨ : قۆناغەکانی ستانداردکردنی زمان

### ١ـ هەڵبژاردنی پێوەرێك

هەمیشە شێوەزارێك بۆ ستانداردکردن هەڵدەبژێردرێ یان لەوانەیە ببێتە زمانی ناوەندێکی گرنگ یان ببێتە تێکەڵەی چەند شێوەزارێکی هەمەجۆر[1].هەڵبژاردنی پێوەرێکیش ڕەنگە ئەستەم بێ، چونکە بەشێوەیەکی گشتیی ئەمە پشت بە هەڵوێستی ئاخاوتنی کۆمەڵگا دەبەستێ، ئاخۆ بەسەر ئەم زەحمەتییە زاڵ دەبن لە هەڵبژاردنی پێوەرێك یان تەنانەت لەبەرانبەر زەحمەتییەکی کەمیش ملکەچ دەبن (چۆك دادەدەن).[2]

لێرەدا پایەی دیالێکتێك یان شێوەزارێك، چ لەلایەنی کۆمەڵایەتی، یان هەژموونی ئایینی یاخود سیاسیی، زۆر گرنگە لە پرۆسەی هەڵبژاردن و دیاریکردنی دیالێکتێك لەنێو دیالێکتەکانی زمانێك، بێگومان ئەم هەڵبژاردنە ڕەمەکی نابێ، بەڵکو دەبێت کەسانی زمانەوان و پسپۆڕ لەبواری زمانەوە ئەنجامی بدەن. هەرچەندە ئەم پرۆسەیە زمانەوانییە، بەڵام زۆرجار دەسەڵاتی سیاسی ڕۆڵی خۆی دەبینێ لە سەپاندنی دیالێکتێك بەسەر دیالێکتەکانی تردا[3].

خاڵێکی تری گرنگ لێرەدا ئەوەیە، دەبێ تەنها دیالێکتێك یان (شێوەزارێك) و تەنها (ئەلفوبێیەك) هەڵبژێردرێ، بۆ ئەوەی تووشی دابەشکردن و پارچە

---

[1]- Hudson R. A.(1980), Sociolinguistics. Cambridge University press, 1980, P. 33.

[2]-Wardhaugh, R. (1986), An Introduction to Sociolinguistics, Great Britain, p. 31.

[3]- سەلام ناوخۆش و نەریمان خۆشناو، کوردۆلۆجی، ل ٨٧ — ٨٨.

پارچەکردن نەبێت.[1] واتە لە توخمی هەڵبژاردندا دیالێکتێك هەڵدەبژێردرێت بۆ ئەوەی ببێتە بنچینە بۆ زمانی ستاندارد[2].

کەواتە لێرەدا گەرەکە دیالێکتێك دەست نیشان بکەین و هەڵیبژێرین، ئەم هەڵبژاردنەش پەیوەستە بە کۆمەڵێ خاسیەت و تایبەتمەندی، لەوانە:ـ

١ـ دیالێکتەکە لە بواری نووسین و ئاخاوتندا خزمەتکرابێ.

٢ـ دیالێکتەکە لە ڕووی فەرهەنگی وشەوە دەوڵەمەندبێ.

٣ـ لەلایەن زۆربەی کۆمەڵانی خەڵکی کۆمەڵگاکەوە ئاشنابێت.

پێگەی جۆرە شێوەزارە هەڵبژێردراوەکە گەشەدەکات و شێوەزارەکانی تر لە ڕوانگەی زمانەوانییەوە بچووك دەبنەوە، هەڵبژاردن و جێگیرکردنی پێوەری زمانەوانی ڕەوتێکی ئاڵۆزە، کە پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆی بە پێکهاتەی زمان و کۆمەڵگەوە هەیە و کاتێك هەموو خەڵکی وەکو یەك قسە بکەن، ئەو گرفتێکی ئەوتۆ نامێنێتەوە، ئەگەر وانەبێت لەوانەیە ناچاربین بڕیاری ئازاردەر دەربکەین، هەڵبژاردنی هەر زمانێکی ڕەسەن بە زمانی ستاندارد، بەمانای پشتگیری کردن لەو خەڵکە دێت، کە بەو زمانە قسەدەکەن، ئەمەش بەها دەدات بەوان، لەبەرئەوەی پێوەرەکە هی ئەوانە، لە پێشبرکێی بەدەست هێنانی دەسەلات ئەو بابەتە وەکو خاڵێکی بەهێز بۆ ئەوان بەکاردێت[3].

دەبێ لێرەدا باسی خاڵێکی گرنگ بکەین، ئەویش ئەوەیە، کە پاڵنەرە سیاسیی و ئایینی و مەزهەبییەکان هەندێك جار ستانداردسازان ناچاردەکەن، بڕیاری سەیر دەربکەن، تەنانەت لەوانەیە زمانێکی لەنێوچوو بهێننەوە گۆڕێ، ستانداردکردنی

---

1- هەمان سەرچاوە، ل ٨٨.

2- غازی عەلی، هەمان سەرچاوە، ل ٢٣٥.

3- ناصر قلی سارلی، ل ٢٢٠.

زمانی عیبری باشترین نموونەیە، کاتێك کۆچی بە کۆمەڵی یەهودیەکان لە کۆتایی سەدەی نۆزدەیەم و سەرەتای سەدەی بیستەم بۆ فەلەستین دەستی پێکرد، هیچ کەسێك بە زمانی عیبری کلاسیك قسەی نەدەکرد، ئەو جۆرە زمانە تەنها لە کتێبە یەهودییەکان بەرچاو دەکەوت، پاڵنەرە ئایینی و سیاسییەکان بوونە هۆی ئەوەی ئەنجوومەنێکی زمانەوانی لەساڵی ۱۸۹۰ دروست ببێت و بە چالاکییەکی بەرنامەبۆداڕێژراو زمانی عیبری کلاسیکیان گۆڕییەوە بۆ زمانێکی زیندوو، لە ئێستادا ئەو زمانە ئاخێوەری رەسەنی هەیە، هەرچەند لە سەرەتای سەدەی بیستەم و تەنانەت ناوەڕاستی ئەو سەدەیە هیچ کەسێك بڕوای نەبوو ئەو چالاکییە بەرنامە بۆداڕێژراوە بۆ ستانداردکردن تا ئەو ڕێژەیە سەرکەوتوو بێت[1].

**٢ـ بەسیستەمکردنی پێوەرەکە**

لێرەدا یەکخستنی ڕێزمان و فەرهەنگی نەتەوە و ڕێنووس هۆکاری گرنگن، بۆ دامەزراندنی دیالێکتی ستاندارد، بێگومان ڕێزمان و فەرهەنگ و ڕێنووسێکی یەکگرتوو، کۆکردنەوەیەکی ڕۆحی قوتابی و خوێنەواری لێدەکەوێتەوە، بەمەش تاکەکانی نەتەوە هەست بە یەکێتییەکی نەتەوەیی بەهێز دەکەن. دروستبوونی ئەو یەکێتییەش ناوەندێکی ستراتیژی دەبێت بۆ پاراستنی ئاسایشی زمان[2].

بۆ چەسپاندنی شێوەزارێك دەبێ هەندێ فەرهەنگ و کتێبی ڕێزمانی بنووسرێن، کەوا لە ئەندامانی کۆمەڵگا بکات ڕازی بن لەسەر ئەوەی کەچی ڕاستە، ڕێکخستنی یاسا پێویستی بەوەیە کە کەمترین ڕادەی جیاوازی لە فۆڕم و واتادا هەبێت، ئەوەش پێویستە کە ئەو ئەندامانە فێری فۆڕمە ڕاستەکانی بن و ئەو فۆڕمە نادروستانەش لە

---

[1]- سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٢٥ – ٢٢٦.

[2]- سەلام ناوخۆش و نەریمان خۆشناو، هەمان سەرچاوە، ل ٨٨.

نووسین بەکارنەهێنن، کە ڕەنگە لە شێوەزاری خۆیان هەبووبێت، بۆیە لەوانەیە ئەمە یەکێك لە هۆکارەکان بێت کە ئەکادیمیای نەتەوەییەکان لە کارەکانیاندا ڕووبەڕووی کێشە بووبنەوە. ناوەندی کاری ئەو ئەکادیمیانە زۆر ئەرێنی نییە، چونکە هەمیشە ڕووبەڕووی گۆڕانی بەردەوام دەبنەوە و دەبێ لێکۆڵینەوە لەسەر مەسەلە زمانەوانییە تازەکان ئەنجامبدەن، بۆ خستنەڕووی جیاوازی لەنێوان ستانداردکردن و ڕێکخستنی یاساکان لەڕووی بیردۆزییەوە گرنگە، چونکە پۆلێنکردن و ڕێکخستنی ڕێساکانی زمان لە چوارچێوەی هەلومەرجی ئابووری، کۆمەڵایەتی جۆراوجۆرەوە دەبێت، هەروەها جۆر و مەودا و پلەی ڕێکخستنی ڕێساکان پشت بەوە دەبەستێ، کە ئاخۆ تا چەند لەڕووی کۆمەڵایەتییەوە ئەم زمانە ڕێکخراوە بەکاردێ، هەر کاتێك ئەو زمانە لە بەکارهێنان لە ناوەندی فێرکردن و ئەدەب و خوێندنەوەدا فراوان بوو و هەر کاتێك وەکو هۆکاری مانەوە و پاراستنی دەسەڵات بەکارهات، ئەوا ئەوکات دەکرێ بە زمانێکی ستاندارد لەقەڵەم بدرێ[1].

کەواتە لەم قۆناغەدا کۆددانان دەگرێتەوە، کە چۆنیەتی قاڵب وەرگرتنی فۆرمی نووسین لە زمانی ستانداردا (ڕێزمان، وشە و ڕێنووس)، دوای ماوەیەك زمانی ستاندارد دەبێت بە فۆرمێکی ئاسایی نووسین و قسەکردن، هەڵبەتە نووسینی ستاندارد دەبێت بە پارێزراو بە بەراورد لەگەڵ قسەکردنی ستاندارد، چونکە قسەکردن زیاتر لە نووسین ئاڵوگۆڕی بەسەردا دێت، گۆڕانکاری لە نووسینی ستانداردا بە پێی گۆڕانکارییەکانی قسەکردن بگۆڕێن[2].

بەزۆری نووسەری فەرهەنگی زاراوەکان لەم بابەتەدا هاوڕان، کە کاری فەرهەنگنووسین لەسەر چالاکییەکی وەسفکەرانەیە، هەرچەند ئەوان ڕاستوڕەوان

---

1- Hudson, R. A. Sociolinguistics, p 33.

2- غازی عەلی، پرۆژەی زمانی ستانداردی کوردی، ل ٢٣٥ – ٢٣٦.

نانووسن، فلان واژە چۆن دەبێت بەکاربێت، یان خۆمان بەدوور بگرین لە بەرکارهێنانی کام واژە، بەهەرحاڵ فەرهەنگنووسان خۆیان لە پێگەیەك دەبیننەوە، کە دەبێت بڕیار بدەن کە کام واژەیە بڵاوە یان نا، ڕاستە یان نا، ئاساییە یان نائاساییە، زیاتر فەرهەنگە گشتییەکان کە بۆ چەند زمانێکی دنیا بڵاوکراونەتەوە، بەگشتی یان بە تایبەتی دەپرژێنە سەر پێوەرەکانی بەکاربردنی ستاندارد[1].

### ٣ـ قۆناغی پەرەپێدان و فرلوانبوونی لە ئەرکدا:

ئەو شێوازەی کە بە سیستەمکراوە، پێویستی بە گۆڕانێکی زۆر هەیە لە بەکارهێناندا، پێویستە لە بواری زانست، ئەدەبیات، ڕۆژنامەوانی، ... هتد بەکاربهێنرێت[2]. پاش ئەوەی دیالێکتێك لە دیالێکتەکان هەڵبژێردرا و بنەماکانی بەستاندەرکردنی بۆ دارێژراو لەهەموو لایەکەوە بەرەو زمانێکی باڵا بردرا، کە نوێنەری هەموو نەتەوە بێت نەك ناوچەیەك، ڕۆڵی حکومەت دەست پێدەکات لەجێبەجێکردنی ئەم پرۆژە نەتەوەیی و نیشتمانییە، دەبێت حکومەت لە دامودەزگای خۆی بەتایبەتی هەر سێ وەزارەتی پەروەردە و خوێندنی باڵا و ڕۆشنبیری و ڕاگەیاندن خەڵك هانبدات ئەو شێوە زمانە بەکاربێنن و بە زمانی خۆیان بزانن[3].

کەواتە لێرەدا ئەو شێوەزارەی ڕێسای بۆ پۆلێنکراوە بەرزترین ئاست لە گۆڕان لە ئەرکی خۆی بەدەست دێنێ، ئەو فۆرمە دەبێ توانای ئەوەی هەبێت لە هەموو ئەو ئەرکانەی پەیوەستن بە حکومەتی ناوەندی و، نووسین وەکو زمانێکی ڕەسمی

---

1- ناصر قلی سارلی، ل ٢٢٣ – ٢٢٤.

2- Amir Hassan pour, p. 30.

3- سەلام ناوخۆش و نەریمان خۆشناو، کوردۆلۆجی، ل ٨٩.

بەکاربێت، بۆ نموونە لە پەرلەمان، لە کاروباری حکومەت و بەڵگەنامەکانی یاسادانان و ڕاپەڕاندن و بەڵگەنامە دادوەرییەکان و زانستییەکان و سیستمە جۆراوجۆرە پەروەردەییەکان وەکو زمانی فێرکردن، واتە لە ناوەندی فێرکردنی سەرەتایی و ناوەندی و باڵادا، وەکو زمانی فێرکردن لە یاسای وەزارەتی پەروەردە تۆمار دەکرێ، هەروەها ئەم زمانە لە دەستووری وڵاتیشدا دەچەسپێ و، دەبێ شیاو بێ بۆ بەکارهێنانی لە شێوە جیاوازەکانی ئەدەب وەکو زمانێکی نەتەوەیی، کە زمانی کیانێکی سیاسی و کۆمەڵایەتی و کلتورییە لە بەکارهێنانی بۆ ئەو هەموو ئەرکانە، لەوانەیە ئەم فۆرمە پێویستی بە یەکەی زمانەوانی زیاتر هەبێ، بەتایبەتی وشە تەکنیکییەکان، بەڵام ئەمە پێویستە بۆ بەرەوپێشبردنی ئەو نەریتانەی کەوا دەکات ئەو فۆرمە بەدەستهاتووە بەکاربهێنین[1].

لەم قۆناغەدا، زمانی ستاندارد دەبێت هەموو تایبەتمەندییە بنچینەییەکانی پەیوەندیدار بە زمانی باڵادەست بهێنێت، هەروەك فێرگسۆن ئاماژەی پێدەکات، سێ تایبەتمەندی زمانی باڵا ئەمانەن:

١- بەکارهێنانی لە دامودەزگاکانی حکومەت، نووسین و بیرۆکەی باڵا.

٢- بوونی ڕوویەکی زۆر باڵا.

٣- بەکاربردنی لە ئەدەبیات و گەنجینەی ئەدەبیدا[2].

وەکو ئاماژەمان بۆی کرد، کە شێوەزارە هەڵبژێردراوەکە لەم قۆناغەدا لە دامودەزگاکانی حکومەت، دادگاکان، دەقەکانی یاسایی، بەڵگەنامە ئیدارییەکان، نامەگۆڕینەوە ئیدارییەکان، بەکاردەهێنرێت، لەبەر ئەم هۆیە حکومەتەکان گرنگی

---

1- Hudson, R. A. Sociolinguistics, p. 33.

2- Ferguson, C. A. (1996), Diglossia, Oxford, Oxford University Press, p. 326.

زۆر بە زمانی ستاندارد دەدەن و هەوڵدەدەن بۆ گەشەپێدانی، لە دوو ڕوانگەوە زمان بۆ حکومەتەکان گرنگە، یەکێکییان لە کارەکانی حکومەت دووەمیان لە پەروەدە و فێرکردندا، چینی دەسەلاٌتدار و پەیوەندی نێوان حکومەت و خەڵکی پێویستی بە یەك جۆر زمان و شێوەزار هەیە، پەروەدە و فێرکردنیش پێویستی بەو زمانە هەیە، کە بەکاردەهێنرێت[1].

یەکێك لە بەکارهێنانە تازەکانی زمانی ستانداردی تازە دروست بوو ئەوەیە، کە ببێتە زمانی زانستە جیاوازە مرۆییەکان و بیرۆکە هزرییە ئاڵۆزەکان (بالاٌکان)، لە هەندێك لەو زمانانەی کە ڕەوتی ستانداردکردنیان لە رابردوویەکی زۆر دوورەوە دەستی پێکردووە، زۆربەیان لە دەستپێکیانەوە نووسینە زانستییەکان و فەلسەفە دەرکەوتووە، بەلاٌم ئەو زمانانەی تازە ڕەوتی ستانداردکردنیان دەستپێکردووە، بەهۆی ئاڵۆزی زانستی نوێ، تواناو شایستەی ئەو زانستە نین[2].

#### ٤ـ پەسندکردنی لەلایەن کۆمەڵگاوە

دەبێ شێوەزارەکە وەکو زمانی نەتەوەیی لەلایەن قسەکەرانی کۆمەڵگاوە پەسند بکرێ، هەر کاتێك ئەمە ڕوویدا، زمانە ستانداردەکە بەگەڕ دەخرێ، بۆ ئەوەی ببێتە هۆکاری هێز و یەکگرتن لەپێناو دەوڵەتی نەتەوەیی، وەکو هێمای سەربەخۆبوون لەدەست نەتەوەکانی تر و وەکو هێمایەك بۆ حاڵەتی جیابوونەوە و سەربەخۆیی بۆ ئەو نەتەوانەی خاوەن کیانێکی سەربەخۆ نین، ئەمە ڕێك ئەو ئەرکەیە کەوا لە نەتەوەیەك دەکات زیاتر بەرەوپێش بچێت[3].

---

1- ناصر قلی سارلی، ل ٢٢٧.

2- هەمان سەرچاوە، ل ٢٢٧ — ٢٢٨.

3- Wardhaugh, R. An introoduction to Sociolinguistics, p. 30.

شێوازەکەی هۆگن تارادەیەکی زۆر سوود بەخشە لەدروستکردنی پەیوەندی لەنێوان پرۆسە گەورەکانی ستانداردکردن و تێگەیشتن لێیان، بەڵام مەودایەکی فراوان لە مشتومڕ هەڵدەگرێ سەبارەت بە هەندێ لایەنی ستانداردکردن، بۆ نموونە ئەوە گرنگ نییە کە ستانداردکردن دەبێ مەسەلەکەی گۆکردن و نووسینی تێدابێ یان کە زمانی ستاندارد دەبێ وەکو تاکە شێوەزاری ڕاست و دروست دەستی پێوە بگیرێ[1].

ئەگەر وا بڕیاربێت زمانی ستاندارد زمانێکی زیندووی قسەی پێبکرێت و ڕۆڵ و کارکردنی بە باشی ئەنجام بدات، پێویستە زۆرینەی تاکەکانی کۆمەڵگە پەسندی بکەن و ئەو جۆرە زمانە لە کۆمەڵگەدا بڵاوبکرێتەوە، بڵاوکردنەوەی زمانی ستاندارد ڕەوتێکی چەند لایەنییە و سێ جۆری جیاوازی هەیە : بڵاوکردنەوەی لە شوێنی (سنورێکی جوگرافی)، بڵاوکردنەوەی ڕۆڵ وکارکردنی، بڵاوکردنەوەی کۆمەڵایەتی. مەبەست لە بڵاوکردنەوەی شوێنی فراوانکردنی سنوری جوگرافی زمان و ستانداردە و لەنێوبردنی سنورەکان و بەربەستە سروشتییەکانە، لە حاڵەتی بەئەنجام گەیاندنی ئەو جۆرە بڵاوکردنەوەیە، ئاخێوەرانی شێوەزارە جوگرافییەکان لەگەڵ شێوەزاری خۆیان زمانی ستاندارد یان لە شێوەی زمانێکی باڵا بەکاری دەهێنن و لە پەیوەندییە زمانەوانییەکانی خۆیان سوودی لێدەبینن، ڕاگەیاندنەکان بەتایبەت ڕادیۆ و تەلەفزیۆن و سیستەمی پەروەردە و فێرکردن ڕۆلێکی گرنگیان هەیە لە بڵاوکردنەوەی ئەو جۆرە زمانە ستانداردە[2].

---

1- Ali Mahmood Jukil, p. 14.

2- ناصر قلی سارلی، ل ٢٤١ — ٢٤٢.

**٥- قۆناغی پاراستنی ستاندارد**

لەم قۆناغەدا وا پێویست دەکات هەموو لایەك زمانە هەڵبژێردراوەکە بپارێزین، ئەم پارێزگاری لێکردنەش پێویستی بە کات و بەردەوامی هەیە، چونکە زمانی ستاندارد بەردەوام لەلایەن پێوەرەکانی بەربەرەکانی و هەڕەشەی لێدەکرێت و هەمووکات دەکەوێتە بەر شالاوی دزەکردنە ناوی و ناڕەحەت کردنی شێوەزارە جۆراوجۆرەکان. لەوانەیە هەندێك ستاندارد بە تێپەڕینی چەند وەچەیەك گۆڕان بەسەر پێوەرەکانیدا بێت و پێگەی ستانداردی خۆی لەدەست بدات و ستانداردێکی تر جێگەی بگرێتەوە، لەوانەیە خودی زمانی ستانداردیش لە دوای ماوەیەك بەهۆی جۆراوجۆری کارکردنی دابەشبێت بۆ چەند شێوەزارێك، بەمجۆرەش خولی ستانداردکردن بکەوێتەوەگەڕ، بەڵام بەهێزترین پێکهاتەی پاراستنی ستاندارد بەئەگەری زۆرەوە سیستەمی پەروەردە و فێرکردنە، مامۆستایانی فێرگەکان بەزۆری هۆگریەتێکی زۆریان بۆ سەپاندنخوازی و بیرۆکەی نەگۆڕانی زمان هەیە لە سیستەمی فێرکردندا، زمانی نووسین لە پێشترە، زمانی ئاخاوتنی پلان بۆداڕێژراو لە پێشترە لە بێ پلان، پەسندنەکردنی شێوەزاری ناستاندارد ئایدۆلۆژی ستاندارد پێداگیری لەسەر دەکرێت[1].

نووسەرە گەورەکان و دەوڵەمەندی بەرهەمی ئەدەبی هۆکاری ترە بۆ پاراستن و بڵاوکردنەوەی ستاندارد، نووسەرەکان بەو بەرهەمە ئەدەبییە شکۆدارەی کە لەپاش خۆیان بەجێیان هێشتووە، ڕوویەکی باڵا دەبەخشنە زمانی ستاندارد، لەو ڕووەوە وا نیشان دەدرێت هەر کەسێك بیەوێت ببێتە کەسێکی پێگەیشتوو، دەبێت، فێری بەرهەمە ئەدەبییەکان و ستاندارد ببێت، ئەم هۆکارە بەتایبەت کاتێك

---

1- هەمان سەرچاوە، ل ٢٤٧.

کاریگەرە، کە توخمی ئەدەبی ڕۆڵ و ئامادەبوونێکی زیاتریان لە زمانی ستاندارد هەبێت[1].

[1]- سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٤٧.

زمانی عیبری باشترین نموونەیە، کاتێك کۆچی بە کۆمەڵی یەهودیەکان لە کۆتایی سەدەی نۆزدەیەم و سەرەتای سەدەی بیستەم بۆ فەلەستین دەستی پێکرد، هیچ کەسێك بە زمانی عیبری کلاسیك قسەی نەدەکرد، ئەو جۆرە زمانە تەنها لە کتێبە یەهودییەکان بەرچاو دەکەوت، پاڵنەرە ئایینی و سیاسییەکان بوونە هۆی ئەوەی ئەنجوومەنێکی زمانەوانی لەساڵی ١٨٩٠ دروست ببێت و بە چالاکییەکی بەرنامەبۆدارێژراو زمانی عیبری کلاسیکیان گۆڕییەوە بۆ زمانێکی زیندوو، لە ئێستادا ئەو زمانە ئاخێوەری رەسەنی هەیە، هەرچەند لە سەرەتای سەدەی بیستەم و تەنانەت ناوەڕاستی ئەو سەدەیە هیچ کەسێك بڕوای نەبوو ئەو چالاکییە بەرنامە بۆدارێژراوە بۆ ستانداردکردن تا ئەو ڕێژەیە سەرکەوتوو بێت[1].

**٢ـ بەسیستەمکردنی پێوەرەکە**

لێرەدا یەکخستنی ڕێزمان و فەرهەنگی نەتەوە و ڕێنووس هۆکاری گرنگن، بۆ دامەزراندنی دیالێکتی ستاندارد، بێگومان ڕێزمان و فەرهەنگ و ڕێنووسێکی یەکگرتوو، کۆکردنەوەیەکی ڕۆحی قوتابی و خوێنەواری لێدەکەوێتەوە، بەمەش تاکەکانی نەتەوە هەست بە یەکێتییەکی نەتەوەیی بەهێز دەکەن. دروستبوونی ئەو یەکێتییەش ناوەندێکی ستراتیژی دەبێت بۆ پاراستنی ئاسایشی زمان[2].

بۆ چەسپاندنی شێوەزارێك دەبێ هەندێ فەرهەنگ و کتێبی ڕێزمانی بنووسرێن، کەوا لە ئەندامانی کۆمەڵگا بکات ڕازی بن لەسەر ئەوەی کەچی ڕاستە، ڕێکخستنی یاسا پێویستی بەوەیە کە کەمترین ڕادەی جیاوازی لە فۆرم و واتادا هەبێت، ئەوەش پێویستە کە ئەو ئەندامانە فێری فۆڕمە ڕاستەکانی بن و ئەو فۆڕمە نادروستانەش لە

---

[1]- سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٢٥ – ٢٢٦.

[2]- سەلام ناوخۆش و نەریمان خۆشناو، هەمان سەرچاوە، ل ٨٨.

نووسین بەکارنەهێنن، کە ڕەنگە لە شێوەزاری خۆیان هەبووبێت، بۆیە لەوانەیە ئەمە یەکێك لە هۆکارەکان بێت کە ئەکادیمیای نەتەوەییەکان لە کارەکانیاندا ڕووبەڕووی کێشە بووبنەوە. ناوەندی کاری ئەو ئەکادیمیانە زۆر ئەرێنی نییە، چونکە هەمیشە ڕووبەڕووی گۆڕانی بەردەوام دەبنەوە و دەبێ لێکۆڵینەوە لەسەر مەسەلە زمانەوانییە تازەکان ئەنجامبدەن، بۆ خستنەڕووی جیاوازی لەنێوان ستانداردکردن و ڕێکخستنی یاساکان لەڕووی بیردۆزییەوە گرنگە، چونکە پۆلێنکردن و ڕێکخستنی ڕێساکانی زمان لە چوارچێوەی هەلۆمەرجی ئابووری، کۆمەلایەتی جۆراوجۆرەوە دەبێت، هەروەها جۆر و مەودا و پلەی ڕێکخستنی ڕێساکان پشت بەوە دەبەستێ، کە ئاخۆ تا چەند لەڕووی کۆمەلایەتییەوە ئەم زمانە ڕێکخراوە بەکاردێ، هەر کاتێك ئەو زمانە لە بەکارهێنان لە ناوەندی فێرکردن و ئەدەب و خوێندنەوەدا فراوان بوو و هەر کاتێك وەکو هۆکاری مانەوە و پاراستنی دەسەلات بەکارهات، ئەوا ئەوکات دەکرێ بە زمانێکی ستاندارد لەقەڵەم بدرێ[1].

کەواتە لەم قۆناغەدا کۆددانان دەگرێتەوە، کە چۆنیەتی قاڵب وەرگرتنی فۆرمی نووسین لە زمانی ستانداردا (ڕێزمان، وشە و ڕێنووس)، دوای ماوەیەك زمانی ستاندارد دەبێت بە فۆڕمێکی ئاسایی نووسین و قسەکردن، هەڵبەتە نووسینی ستاندارد دەبێت بە پارێزراو بە بەراورد لەگەڵ قسەکردنی ستاندارد، چونکە قسەکردن زیاتر لە نووسین ئاڵوگۆڕی بەسەردا دێت، گۆڕانکاری لە نووسینی ستانداردا بە پێی گۆڕانکارییەکانی قسەکردن بگۆڕێن[2].

بەزۆری نووسەری فەرهەنگی زاراوەکان لەم بابەتەدا هاوڕان، کە کاری فەرهەنگنووسین لەسەر چالاکییەکی وەسفکەرانەیە، هەرچەند ئەوان ڕاستوڕەوان

---

1- Hudson, R. A. Sociolinguistics, p 33.

2- غازی عەلی، پرۆژەی زمانی ستانداردی کوردی، ل ٢٣٥ — ٢٣٦.

نانووسن، فلان واژە چۆن دەبێت بەکاربێت، یان خۆمان بەدوور بگرین لە بەرکارهێنانی کام واژە، بەهەرحاڵ فەرهەنگنووسان خۆیان لە پێگەیەك دەبیننەوە، کە دەبێت بڕیار بدەن کە کام واژەیە بڵاوە یان نا، ڕاستە یان نا، ئاساییە یان نائاساییە، زیاتر فەرهەنگە گشتییەکان کە بۆ چەند زمانێکی دنیا بڵاوکراونەتەوە، بەگشتی یان بە تایبەتی دەپرژێنە سەر پێوەرەکانی بەکاربردنی ستاندارد[1].

### ٣ـ قۆناغی پەرەپێدان و فراوانبوونی لە ئەرکدا:

ئەو شێوازەی کە بە سیستەمکراوە، پێویستی بە گۆڕانێکی زۆر هەیە لە بەکارهێناندا، پێویستە لە بواری زانست، ئەدەبیات، ڕۆژنامەوانی، ... هتد بەکاربهێنرێت[2]. پاش ئەوەی دیالێکتێك لە دیالێکتەکان هەڵبژێردرا و بنەماکانی بەستاندەرکردنی بۆ دارێژراو لەهەموو لایەکەوە بەرەو زمانێکی باڵا بردرا، کە نوێنەری هەموو نەتەوە بێت نەك ناوچەیەك، ڕۆڵی حکومەت دەست پێدەکات لەجێبەجێکردنی ئەم پرۆژە نەتەوەیی و نیشتمانییە، دەبێت حکومەت لە دامودەزگای خۆی بەتایبەتی هەر سێ وەزارەتی پەروەردە و خوێندنی باڵا و ڕۆشنبیری و ڕاگەیاندن خەڵك هانبدات ئەو شێوە زمانە بەکاربێنن و بە زمانی خۆیان بزانن[3].

کەواتە لێرەدا ئەو شێوەزارەی ڕێسای بۆ پۆلێنکراوە بەرزترین ئاست لە گۆڕان لە ئەرکی خۆی بەدەست دێنێ، ئەو فۆرمە دەبێ توانای ئەوەی هەبێت لە هەموو ئەو ئەرکانەی پەیوەستن بە حکومەتی ناوەندی و، نووسین وەکو زمانێکی ڕەسمی

---

[1]- ناصر قلی سارلی، ل ٢٣٣ – ٢٣٤.

[2]- Amir Hassan pour, p. 30.

[3]- سەلام ناوخۆش و نەریمان خۆشناو، کوردۆلۆجی، ل ٨٩.

بەکاربێت، بۆ نموونە لە پەرلەمان، لە کاروباری حکومەت و بەڵگەنامەکانی یاسادانان و ڕاپەڕاندن و بەڵگەنامە دادوەرییەکان و زانستییەکان و سیستەمە جۆراوجۆرە پەروەردەییەکان وەکو زمانی فێرکردن، واتە لە ناوەندی فێرکردنی سەرەتایی و ناوەندی و باڵادا، وەکو زمانی فێرکردن لە یاسای وەزارەتی پەروەردە تۆمار دەکرێ، هەروەها ئەم زمانە لە دەستووری وڵاتیشدا دەچەسپێ و، دەبێ شیاو بێ بۆ بەکارهێنانی لە شێوە جیاوازەکانی ئەدەب وەکو زمانێکی نەتەوەیی، کە زمانی کیانێکی سیاسی و کۆمەڵایەتی و کلتورییە لە بەکارهێنانی بۆ ئەو هەموو ئەرکانە، لەوانەیە ئەم فۆرمە پێویستی بە یەکەی زمانەوانی زیاتر هەبێ، بەتایبەتی وشە تەکنیکییەکان، بەڵام ئەمە پێویستە بۆ بەرەوپێشبردنی ئەو نەریتانەی کەوا دەکات ئەو فۆرمە بەدەستهاتووە بەکاربهێنین[1].

لەم قۆناغەدا، زمانی ستاندارد دەبێت هەموو تایبەتمەندییە بنچینەییەکانی پەیوەندیدار بە زمانی باڵابەدەست بهێنێت، هەروەك فێرگسۆن ئاماژەی پێدەکات، سێ تایبەتمەندی زمانی باڵا ئەمانەن:

١ـ بەکارهێنانی لە دامودەزگاکانی حکومەت، نووسین و بیرۆکەی باڵا.

٢ـ بوونی ڕوویەکی زۆر باڵا.

٣ـ بەکاربردنی لە ئەدەبیات و گەنجینەی ئەدەبیدا[2].

وەکو ئاماژەمان بۆی کرد، کە شێوەزارە هەڵبژێردراوەکە لەم قۆناغەدا لە دامودەزگاکانی حکومەت، دادگاکان، دەقەکانی یاسایی، بەڵگەنامە ئیدارییەکان، نامەگۆڕینەوە ئیدارییەکان، بەکاردەهێنرێت، لەبەر ئەم هۆیە حکومەتەکان گرنگی

---

[1]- Hudson, R. A. Sociolinguistics, p. 33.

[2]- Ferguson, C. A. (1996), Diglossia, Oxford, Oxford University Press, p. 326.

زۆر بە زمانی ستاندارد دەدەن و هەوڵدەدەن بۆ گەشەپێدانی، لە دوو ڕوانگەوە زمان بۆ حکومەتەکان گرنگە، یەکێکییان لە کارەکانی حکومەت دووەمیان لە پەروەدە و فێرکردندا، چینی دەسەڵاتدار و پەیوەندی نێوان حکومەت و خەڵکی پێویستی بە یەك جۆر زمان و شێوەزار هەیە، پەروەدە و فێرکردنیش پێویستی بەو زمانە هەیە، کە بەکاردەهێنرێت[1].

یەکێك لە بەکارهێنانە تازەکانی زمانی ستانداردی تازە دروست بوو ئەوەیە، کە ببێتە زمانی زانستە جیاوازە مرۆییەکان و بیرۆکە هزرییە ئاڵۆزەکان (باڵاکان)، لە هەندێك لەو زمانانەی کە ڕەوتی ستانداردکردنیان لە رابردوویەکی زۆر دوورەوە دەستی پێکردووە، زۆربەیان لە دەستپێکیانەوە نووسینە زانستییەکان و فەلسەفە دەرکەوتووە، بەڵام ئەو زمانانەی تازە ڕەوتی ستانداردکردنیان دەستپێکردووە، بەهۆی ئاڵۆزی زانستی نوێ، تواناو شایستەی ئەو زانستە نین[2].

## ٤ـ پەسندکردنی لەلایەن کۆمەڵگاوە

دەبێ شێوەزارەکە وەکو زمانی نەتەوەیی لەلایەن قسەکەرانی کۆمەڵگاوە پەسند بکرێ، هەر کاتێك ئەمە ڕوویدا، زمانە ستانداردەکە بەگەڕ دەخرێ، بۆ ئەوەی ببێتە هۆکاری هێز و یەکگرتن لەپێناو دەوڵەتی نەتەوەیی، وەکو هێمای سەربەخۆبوون لەدەست نەتەوەکانی تر و وەکو هێمایەك بۆ حاڵەتی جیابوونەوە و سەربەخۆیی بۆ ئەو نەتەوانەی خاوەن کیانێکی سەربەخۆ نین، ئەمە ڕێك ئەو ئەرکەیە کەوا لە نەتەوەیەك دەکات زیاتر بەرەوپێش بچێت[3].

---

1- ناصر قلی سارلی، ل ٢٢٧.

2- هەمان سەرچاوە، ل ٢٢٧ — ٢٢٨.

3- Wardhaugh, R. An introoduction to Sociolinguistics, p. 30.

شێوازەکەی هۆگن تاڕادەیەکی زۆر سوود بەخشە لەدروستکردنی پەیوەندی لەنێوان پڕۆسە گەورەکانی ستانداردکردن و تێگەیشتن لێیان، بەڵام مەودایەکی فراوان لە مشتومڕ هەڵدەگرێ سەبارەت بە هەندێ لایەنی ستانداردکردن، بۆ نموونە ئەوە گرنگ نییە کە ستانداردکردن دەبێ مەسەلەکەی گۆکردن و نووسینی تێدابێ یان کە زمانی ستاندارد دەبێ وەکو تاکە شێوەزاری ڕاست و دروست دەستی پێوە بگیرێ[1].

ئەگەر وا بڕیاربێت زمانی ستاندارد زمانێکی زیندووی قسەی پێبکرێت و ڕۆڵ و کارکردنی بە باشی ئەنجام بدات، پێویستە زۆرینەی تاکەکانی کۆمەڵگە پەسندی بکەن و ئەو جۆرە زمانە لە کۆمەڵگەدا بڵاوبکرێتەوە، بڵاوکردنەوەی زمانی ستاندارد ڕەوتێکی چەند لایەنییە و سێ جۆری جیاوازی هەیە : بڵاوکردنەوەی لە شوێنی (سنورێکی جوگرافی)، بڵاوکردنەوەی ڕۆڵ وکارکردنی، بڵاوکردنەوەی کۆمەڵایەتی. مەبەست لە بڵاوکردنەوەی شوێنی فراوانکردنی سنوری جوگرافی زمان و ستانداردە و لەنێوبردنی سنورەکان و بەربەستە سروشتییەکانە، لە حاڵەتی بەئەنجام گەیاندنی ئەو جۆرە بڵاوکردنەوەیە، ئاخێوەرانی شێوەزارە جوگرافییەکان لەگەڵ شێوەزاری خۆیان زمانی ستاندارد یان لە شێوەی زمانێکی بالا بەکاری دەهێنن و لە پەیوەندییە زمانەوانییەکانی خۆیان سوودی لێدەبینن، ڕاگەیاندنەکان بەتایبەت ڕادیۆ و تەلەفزیۆن و سیستەمی پەروەردە و فێرکردن ڕۆڵێکی گرنگیان هەیە لە بڵاوکردنەوەی ئەو جۆرە زمانە ستانداردە[2].

---

1- Ali Mahmood Jukil, p. 14.

2- ناصر قلی سارلی، ل ٢٤١ – ٢٤٢.

**٥- قۆناغی پاراستنی ستاندارد**

لەم قۆناغەدا وا پێویست دەکات هەموو لایەك زمانە هەڵبژێردراوەکە بپارێزین، ئەم پارێزگاری لێکردنەش پێویستی بە کات و بەردەوامی هەیە، چونکە زمانی ستاندارد بەردەوام لەلایەن پێوەرەکانی بەربەرەکانی و هەڕەشەی لێدەکرێت و هەمووکات دەکەوێتە بەر شالاوی دزەکردنە ناوی و ناڕەحەت کردنی شێوەزارە جۆراوجۆرەکان. لەوانەیە هەندێك ستاندارد بە تێپەڕینی چەند وەچەیەك گۆڕان بەسەر پێوەرەکانیدا بێت و پێگەی ستانداردی خۆی لەدەست بدات و ستانداردێکی تر جێگەی بگرێتەوە، لەوانەیە خودی زمانی ستانداردیش لە دوای ماوەیەك بەهۆی جۆراوجۆری کارکردنی دابەشبێت بۆ چەند شێوەزارێك، بەمجۆرەش خولی ستانداردکردن بکەوێتەوەگەڕ، بەڵام بەهێزترین پێکهاتەی پاراستنی ستاندارد بەئەگەری زۆرەوە سیستەمی پەروەردە و فێرکردنە، مامۆستایانی فێرگەکان بەزۆری هۆگریەتێکی زۆریان بۆ سەپاندنخوازی و بیرۆکەی نەگۆڕانی زمان هەیە لە سیستەمی فێرکردندا، زمانی نووسین لە پێشترە، زمانی ئاخاوتنی پلان بۆداڕێژراو لە پێشترە لە بێ پلان، پەسندنەکردنی شێوەزاری ناستاندارد ئایدۆلۆژی ستاندارد پێداگیری لەسەر دەکرێت[1].

نووسەرە گەورەکان و دەوڵەمەندی بەرهەمی ئەدەبی هۆکاری ترە بۆ پاراستن و بڵاوکردنەوەی ستاندارد، نووسەرەکان بەو بەرهەمە ئەدەبییە شکۆدارەی کە لەپاش خۆیان بەجێیان هێشتووە، ڕوویەکی باڵا دەبەخشنە زمانی ستاندارد، لەو ڕووەوە وا نیشان دەدرێت هەر کەسێك بیەوێت ببێتە کەسێکی پێگەیشتوو، دەبێت، فێری بەرهەمە ئەدەبییەکان و ستاندارد ببێت، ئەم هۆکارە بەتایبەت کاتێك

---

1- هەمان سەرچاوە، ل ٢٤٧.

کاریگەرە، کە توخمی ئەدەبی ڕۆڵ و ئامادەبوونێکی زیاتریان لە زمانی ستاندارد هەبێت[1].

[1]- سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٤٧.

## بەشی چوارەم: چەند لایەنێکی ڕێزمانی کرمانجی سەروو

### ٤ـ١: نێر و مێ

لە کرمانجی ناوەڕاستی زمانی کوردیدا دەمێکە نیشانەی تایبەتی ڕەگەزی نێر و مێ لەناوچووە، تەنیا لە یەك حاڵەتدا ماوە، ئەویش لە دۆخی بانگکردندا، بەجۆرێك لەم دۆخەدا نیشانەی تایبەتی هەیە بۆ جیاکردنەوەی نێر و مێ، بەمشێوەیەی خوارەوە:

اـ نیشانەی (ە) بۆ تاکی نێر بەکاردێت، وەك:

**ـ کوڕە، بخوێنە .**

ب ـ نیشانەی (ێ) بۆ تاکی مێ بەکاردێت، وەك:

**ـ کچێ دانیشە .**

ج ـ نیشانەی (ینە) بۆ کۆی نێر و مێ بەکاردێت، وەك:

**ـ ئەی کوڕینە وەرنە زانکۆ .**

لە کرمانجی سەرووی زمانی کوردیدا ئەگەرچی بەهۆی کرداری بیستنەوە نێر و مێ لەیەکتر جیادەکرێنەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بە هۆی نیشانەی تایبەتییەوە جیاوازی نێر و مێ دەکرێت، ئەم جیاوازی کردنەش بەهۆی نیشانەی ڕەگەز و ئامرازی دانەپاڵ و جێناو و ئاوەڵناو و دۆخی بانگکردنەوە دەبێت، هەروەکو لە خوارەوە ڕوونی دەکەینەوە:

**١ـ بەهۆی نیشانەی تایبەتی ڕەگەزەوە:**

لێرەدا نیشانەی (ی) بۆ ڕەگەزی نێر و نیشانەی (ێ) بۆ ڕەگەزی مێ بەکاردێت و دەچێتە سەر ناوەکەوە، بەو واتایەی ناوەکە بەهۆی ئەم نیشانەوە دەناسرێت، وەکو:

**ـ ئازادی نان خوار .**

**ـ نەسرینێ نان خوار .**

**٢ـ بەهۆی ئامرازی دانەپالٚ:**

کاتێك دوو وشە بەهۆی ئامرازی دانەپالٚ لێکدەدرێن، ئەوە ئامرازەکانی دانـەپالٚ بۆ نێر و مێ و تاك و کۆ جیاوازییان لە نێواندا هەیە، بەمشێوەیە:

اـ ئامرازی دانەپالٚی (ا) بۆ تاکی مێ بەکاردێت، وەك:

**ـ کچا نەسرینێ هات .**

ب ـ ئامرازی دانەپالٚی (ێ) بۆ تاکی نێر بەکاردێت، وەك:

**ـ کوڕێ ئازادی زیرەکە .**

ج ـ ئامرازی دانەپالٚی (ێد، ێن، ێت) بۆ کۆی نێر و مێ بەکاردێت، وەك:

**ـ چیایێت کوردستانێ بلٚندن .**

**٣ـ بەهۆی جێناو:**

**اـ جێناوی کەسی سەربەخۆ :**

لە کەسی سێیەمی تاکدا، لـە کۆمـەلٚی (مـن ـ مـە) جیـاوازی لـە نێـوان نێـر و مێدا دەکرێت، بەمشێوەیە:

وی/ جێناوی سەربەخۆیە بۆ کەسی سێیەمی تاکی نێر، وەك:

**ـ وی نان خوار .**

وێ/ جێناوی سەربەخۆیە بۆ کەسی سێیەمی تاکی مێ، وەك:

**ـ وێ نان خوار .**

**ب ـ جێناوی نیشانە:**

لە کرمانجی سەرووی زمانی کوردیدا، حەوت جێناوی نیشانەمان هەیە، کە بۆ تاك، کۆ، نێر، مێ، نزیك، دوور بەکاردەهێنرێت، جێناوەکانیش بەمشێوەیەی خوارەوەن[1]:ـ

ئەڤە ــــــ بۆ تاکی نزیك بەکاردێت .

ڤی ــــــ بۆ تاکی نێری نزیك بەکاردێت .

ڤێ ــــــ بۆ تاکی مێی نزیك بەکاردێت .

وی ــــــ بۆ تاکی نێری دوور بەکاردێت .

وێ ــــــ بۆ تاکی مێی دوور بەکاردێت .

(ئەڤان) ڤان ــــــ بۆ کۆی نێر و مێی نزیك بەکاردێت .

(ئەوان) وان ــــــ بۆ کۆی نێر و مێی دوور بەکاردێت .

**ئەڤە پسمامێ منە.**

**ڤی نەگرە[2].**

**ئەڤە هەڤالی منە .**

**ڤی نان خارد .**

**ڤێ نان خارد .**

**وی چیرۆك نڤیسی .**

**وێ چیرۆك نڤیسی .**

---

[1] ـ لێژنەیەك لە وەزارەتی پەروەردە، زمان و ئەدەبی کوردی، پۆلی هەشتەمی بنەرەتی، چاپی سێیەم، چاپخانەی ئەکاسیا، هەولێر، ٢٠٠٩، ل ٨٢ ـــ ٨٣ .

[2] ـ صادق بهاءالدین ئامێدی، رێزمانا کوردی ـــ کرمانجی یا ژۆری و ژێری یا هەڤبەرکری، چاپا یەکێ، زانکۆی سەلاحەدین، دار الشؤون الثقافیة العامة، ١٩٨٧، ل ١٣٧ .

ڤان گۆڤەندەکا خۆش گرێدا .

وان ڕەشبەلەك گرێدا .

٤ـ ئاوەڵناوی نیشانە:

لە کرمانجی سەرووی زمانی کوردیدا فۆرمەکانی ئاوەڵناوی نیشانە لەگەڵ ناوی تاك و کۆ و نێر و مێ بەشێوەی جیاواز بەکاردێن، بەمشێوەیەی خوارەوەن:

ئەڤ..... ە ـــــ لەگەڵ ناوێك بۆ تاکی نێر و مێی نزیك بەکاردێ.

ڤی..... ی ـــــ لەگەڵ ناوێك بۆ تاکی نێری نزیك بەکاردێ.

ڤێ ....ێ ـــــ لەگەڵ ناوێك بۆ تاکی مێی نزیك بەکاردێ.

وی.....ی ـــــ لەگەڵ ناوێك بۆ تاکی نێری دوور بەکاردێ.

وێ..... ێ ـــــ لەگەڵ ناوێك بۆ تاکی مێی دوور بەکاردێ.

ڤان(ئەڤان)..... ان ـــــ لەگەڵ ناوێك بۆ تاکی نێر و مێی نزیك بەکاردێ.

وان(ئەوان) ....ان ـــــ لەگەڵ ناوێك بۆ کۆی نێر و مێی دوور بەکاردێ.

- ئەڤ کتێبە یێ مەیە.
- ڤی خورتی سەرێ مە بلند کر .
- ڤێ قوتابیێ وانە باش خواند .
- وی ڕەزڤانی ڕەزێ خۆ فرۆت .
- وێ گۆتنێ دلێ مە خۆشکر .
- ڤان گولان بچینە .
- وان جوتیاران زەڤیێن خۆ کێلان .

**٥ـ دۆخی بانگکردن:**

له حاڵەتی بانگکردندا، چەند نیشانەیەك بە ناو دەلکێت، بەهۆیەوە ڕەگەزی ناوەکە دیاری دەکرێت، نیشانەکانیش بریتین له :

اـ نیشانەی (ۆ) بۆ تاکی نێر بەکاردێت، وەك:

**ـ کوڕۆ، بخوێنە داسەرکەڤی .**

ب ـ نیشانەی (ێ) بۆ تاکی مێ بەکاردێت، وەك:

**ـ خویشکێ، چێلێ بدۆشە .**

ج ـ نیشانەی (ینە) بۆ کۆی نێر و مێ بەکاردێت، وەك:

**ـ کوڕینە ڤان کاران نەکەن .**

لەگەڵ ئەوەشدا (سادق بەهائەدین ئامێدی) له کتێبی (ڕێزمانا کوردی)دا، چەندین حاڵەتی دیاریکراو دەست نیشان دەکات بۆ جیاکردنەوەی نێر و مێ، بۆیە لێرەدا ئاماژە بە هەندێکیان دەکەین :[1]

١ـ ئەگەر دار و درەخت وشك و ڕەق بێت، ئەوە نێرە، وەك: **(دارێ گوێزێ )**، **(دارێ سێڤی)**، بەڵام ئەگەر دارەکە تەڕ و سەوز بێت، ئەوە مێیە، وەك: **(دارا گوێزێ)**، **(دارا سێڤی)**.

٢ـ بواری ئاوەدانی وەك (خانوو، باڵەخانە،بازاڕ، شار، قەزا، ناحیە، گوند، کاول، دیوار،بان..) له ڕەگەزی نێرن، وەك : **(خانیێ مەزن)**، **(خانیێ دە ئۆدە)**، بەڵام **(گەڕەك، کوچە، ئەشکەوت)** له ڕەگەزی مێن .

٣ـ هاوارکردن و قیژەکردن مێیە، وەك **(هاوارا دوی گورگی)** .

---

[1] ـ بڕوانە: ١ـ صادق بهاوالدین ئامێدی، ڕێزمانا کوردی، ل١٧٦ـ ١٧٧ . ٢ـ موکەڕەم ڕەشید تاڵەبانی، دەستوری شیکردنەوە لە زمانی کوردیدا،لە بلاوکراوەکانی گۆڤاری ئاسۆی پەروەردەیی، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر،٢٠٠٨، ل٥٨ـ٦٠ .

٤ـ هەموو ئەستێرەکانی ئاسمان، جگە لە (تەرمی نویحیٚ)، هەمووی لە ڕەگەزی مێن.

٥ـ هەرچی نزمی و دەشتایی هەیە لەسەر ڕووی زەوی جگە لە (گەلی)، هەمووی لە ڕەگەزی مێن .

٦ـ هەموو ئاوی سەر ڕووی زەوی(دەریا، زەریا، جۆگە و جۆبار....) لە ڕەگەزی مێن، جگە لە (ڕووبار، چەم، ئۆقیانوس) لە ڕەگەزی نێرن.

٧ـ هەرچی میوە و بەرهەم ی دار و درەختە(جگە لە تریٚ) لە ڕەگەزی مێن .

٨ـ هەموو چاوگەکانی زمانی کوردی لە ڕەگەزی مێن .

٩ـ هەموو ناوێکی واتایی لە ڕەگەزی مێیە .

١٠ـ ئەندامەکانی لەشی مرۆڤ (سەر، گویٚ، دەم، چاو،مل، ددان، زمان، سینگ، گەروو) لە ڕەگەزی نێرن، بەڵام ئەندامەکانی (دەست، پیٚ، پەنجە، لووت، دلٚ، لێو.....) لە ڕەگەزی مێن .

١١ـ ئامێرەکانی (داس، قەیناخ، خاکەناس، بێلٚ) لە ڕەگەزی مێن، جگە لەمانە هەموو ئامێرەکانی تر لە ڕەگەزی نێرن .

١٢ـ هەموو دەشت و دەشتاییێك لە ڕەگەزی مێیە، وەك: **(دەشتا بتوێنیٚ)**،**(دەشتا شەهرەزوریٚ)**.

١٣ـ هەموو چیاییێك لە ڕەگەزی نێرە، وەك : **(چیاییٚ مەتینا)**،**(چیاییٚ قەندیلی)**، بەڵام **(تەپۆلکە، شاخ، لوتکە....)** لە ڕەگەزی مێن .

١٤ـ چەکی شەڕکردن و بواری جەنگ **(تیر، کەوان،موشەك، تانك، فڕۆکە.....)** لە ڕەگەزی مێن .

١٥ـ خشلٚ و زێڕی ئافرەتان هەمووی مێن، جگە لە **(بازن و گوارە)** بە تاك دەبێتە نێر.

١٦- جلوبەرگی لەبەرکردن و لەپێ کردن، وەك (**کڵاو، کراس،پەستەك، ڕانك، چۆغەر، بێجامە، کەوا**) لە ڕەگەزی نێرن، ئەوانی دیکە وەك (**پشتوێن، پێڵاو، شاڵ، دەسماڵ**) هەمووی لە ڕەگەزی مێن .

١٧- هەموو شتێکی دەوری زەوی لە چینی هەوای ئاسمان لەگەڵ ڕەشەبا و ئاسمان لە ڕەگەزی نێرن، بەڵام (**بەفر، باران، تەزرە،باهۆز، لافاو، زوقم، شەونم، شێ، تەمومژ،تەڕایی**) لە ڕەگەزی مێن .

١٨- ئامێرەکانی بواری نووسین (**پێنووس، مەرەکەب**) لە ڕەگەزی نێرن، بەڵام (**دەفتەر، پەرتووك، تەباشیر، کتێب.....**) لە ڕەگەزی مێن .

**١٩- شتی سەرەکی خوێندن (پۆل، تەختەڕەشە، مێز....)** لە ڕەگەزی نێرن، بەڵام ئەوانی دیکە وەك (کورسی، کتێبخانە..) لە ڕەگەزی مێن .

**٢-٤ :ئامرازی دانەپاڵ**

لە زمانی کوردیدا، جگە لە زاراوەی ئامرازی دانەپاڵ، ئەوە زاراوەکانی (خستنەپاڵ، خستنەسەر، ئیزافە) بەکاردێن، کە هەر هەموومان هەمان مەبەست دەگەیەنێ.

ئامرازی دانەپاڵ، بەو ئامرازانە دەوترێت، کە دوو وشە دەخەنە پاڵ یەکترییەوە، بەهۆیەوە گرێیەک (فرێزێك) دروست دەکەن، واتە ناوێك دەخاتە پاڵ ناوێك یان ناوێك دەخاتە پاڵ جێناوێك یان ناوێك دەخاتە پاڵ ئاوەڵناوێك یان جێناوێك دەخاتە پاڵ ئاوەڵناوێك یان دوو ئاوەڵناو دەخاتە پاڵ یەکتری یان.......هتد.

لە کرمانجی ناوەڕاستی زمانی کوردیدا (ی) ئامرازی دانەپاڵە و دوو وشە دەخاتە پاڵ یەکترییەوە، ئینجا ئەم دوو وشەیە تك بن یان کۆ یان نێر بن یان مێ ......و یاساکانی سازکردنیشی بەمشێوەیەی خوارەوەیە:

**١- ناو + ی + ناو**

**کوڕ + ی + ئازاد**

**- کوڕی ئازاد زیرەکە.**

**٢- ناو + ی + جێناو**

**کوڕ + ی + ئەو**

**- کوڕی ئەو هات .**

**٣- ناو + ی + ئاوەڵناو**

**کچێك + ی + جوان**

**- کچێکی جوان ڕۆیشت .**

**٤- جێناو + ی + ئاوەڵناو**

**ئێوە + ی + تیکۆشەر**

- **ئێوەی تێکۆشەر سەردەکەون .**

**٥ـ ئاوەڵناو + ی + ئاوەڵناو**

**باڵا بەرز + ی + چاوشین**

- **من کچێکی باڵا بەرزی چاوشینم بینی .**

هەروەها هەر لە کرمانجی ناوەڕاست هەندێ جار لە جێگەی (ی)، ئەوە (ە) وەکو ئامرازی دانەپاڵ بەکاردێت، لەوکاتەی کە ئامرازی ناسراوی لەسەر ناو لادەچێ و دەچێتە سەر ئاوەڵناو، بەڵام هەر بۆ ناوەکە دەگەڕێتەوە، وەك:

- **کوڕە زیرەکەکە هات .**

- **کچە جوانەکە ڕۆیشت .**

بەڵام لە کرمانجی سەرووی زمانی کوردیدا، ئامرازەکانی دانەپاڵ جیاوازی لە ڕووی تاك و کۆ و نێر و مێ تێدەکەوێت، کە بەمشێوەیەی خوارەوەن:

١ـ نیشانەی (ا) بۆ تاکی مێ بەکاردێت، وەك:

**کچ + ا + ڕزگاری**

- **کچا ڕزگاری زیرەکە .**

**کچ + ا + تە**

- **کچا تە هات .**

**کچ + ا + قەشەنگ**

- **کچا قەشەنگ ڕۆیشت .**

٢ـ نیشانەی (ێ) بۆ تاکی نێر بەکاردێ، وەك:

**کوڕ + ێ + ڕزگار**

- **کوڕی ڕزگاری هات .**

**کوڕ + ێ + من**

- کورێ من زیرەکە .

کوڕ + ێ + زیرەك

- کوڕێ زیرەك سەردکەڤی .

٣- نیشانەکانی (ێد، ێن، ێت) بۆ کۆی نێر و مێ بەکاردێن، وەك:

کوڕ + ێد + مە

چیا + یێت + کوردستان

چاڤ + ێن + تە

- کوڕێد مە زیرەکن .

- چیایێت کوردستانێ بلندن .

- چاڤێن تە جوانن .

**٣ـ٤:ناو**

بەشێکە لە بەشەکانی ئاخاوتن، ئەو ناوانە دەگرێتەوە کە بەسەر گیاندارێك یان بێگیانێـك یـان بیرێـك یـان ڕووداوێـك دەنرێـت یـان دادەبـڕێ، کـە دەبێتـە هـۆی دیاریکردنی.

**ناوی کۆ**

بەو ناوانە دەوترێ کە بۆ کۆمەڵە کەسێك یاخود کۆمەڵە شتێك بەکاردێن. لە زمانی کوردیدا لە دوو شت یان دوو کەس زیاتر بێ، دەبێتە کۆ. لە زمانی کوردیدا بە هۆی نیشانەی تایبەتییەوە ناوێك لە تاکەوە دەگۆڕدرێ بۆ کۆ.

لە کرمـانجی سـەرووی زمـانی کوردیـدا، لـە پـاڵ ئـەوەی کـە نـاوی تـاك بـەهۆی نیشانەی (ان) کۆ دەکرێتەوە، بەڵام هەندێ جار تەنیا بە (ا) ناوەکە کۆ دەکرێتـەوە، واتە (ن) تێدەچێ و ناهێتە گوتن و نڤیسین، وەك:

**ژن..................ژنان، ژنا**

**مرۆڤ.................مرۆڤان، مرۆڤا**

**مامۆستا...............مامۆستایان، مامۆستایا**

**ناو لە ڕووی ڕەگەزەوە**

لە کرمانجی سەرووی زمانی کوردیشدا، بەهـەمان شـێوە، بـەهۆی زیـادکردنی پەیڤی (مێ) و (نێر) ڕەگەزی ناوەکە دیاری دەکرێت[1]، وەکو:

---

[1] – جەلادەت ئالی بەدرخان، ئەلفابێیا کوردی و بنگەهێن گرامەرا کورمانجی، ڤەگوهاستن ژ تیپێن لاتینی: مەسعود خالد گولی، چاپخانەی خەبات، دهۆك، ٢٠٠١، ل ٦٦ ـ ٦٧.

| ناو | نێر | مێ |
| --- | --- | --- |
| کەو | کەوێ نێر | کەوا مێ |
| کەر | کەرێ نێر | کەرا مێ |
| پسنگ | پسنگێ نێر | پسنگا مێ |
| سیخور | سیخورێ نێر | سیخورا مێ |
| هرچ | هرچێ نێر | هرچا مێ |
| گور | گورێ نێر | گورا مێ |
| فیل | فیلێ نێر | فیلا مێ |
| کەڤرۆشك | کەڤرۆشکێ نێر | کەڤرۆشکا مێ |

هەروەها لە کرمانجی سەروودا هەندێ ناو بەرچاو دەکەون، کە ئەگەرچی لە ڕیزی ڕەگەزی دوولایەن دادەنرێت، وەك ناوەکانی (هەڤال، سەرکار، دژمن، دۆست، بەرخ، کار، گۆلك، پشیك، کاڤر...هتد)، کەچی لە دۆخی دانەپاڵیدا بەهۆی نیشانەی مۆرفۆلۆژییەوە دەکرێن بە نێر یان مێ، بەجۆرێك کاتێ نیشانەی (ێ)یان دەچێتەسەر، ئەوە ناوەکە دەبێتە ناوی مێ، بەلام ئەگەر نیشانەی (ی)یان بچێتە سەر، ئەوە ناوەکە دەبێتە نێر، وەك:-

**- ئەزێ بەرخێ چێرینم .(من بەرخی مێ دەلەوەڕێنم).**

**- ئەزی بەرخی چێرینم.(من بەرخی نێر دەلەوەڕێنم).**[1]

[1] – ئەورەحمانی حاجی مارف (د)، ڕێزمانی کوردی، ناو، ل ١٨٣.

هەرەوەها لە کرمانجی سەرووی زمانی کوردیدا وەکو پێشتر وتمان جیاوازی نێر و مێ دەکرێت، ئەم جیاوازی کردنەش بەهۆی نیشانەی ڕەگەز و ئامرازی دانەپاڵ و جێناو و ئاوەڵناوەوە دەبێت، هەروەکو لە خوارەوە ڕوونی دەکەینەوە:

**١ـ بەهۆی نیشانەی تایبەتی ڕەگەزەوە:**

لێرەدا نیشانەی (ی) بۆ ڕەگەزی نێر و نیشانەی (ێ) بۆ ڕەگەزی مێ بەکاردێت و دەچێتە سەر ناوەکەوە، بەو واتایەی ناوەکە بەهۆی ئەم نیشانەوە دەناسرێت، وەکو:

**ـ ئازادی نان خوار .**

**ـ نەسرینێ نان خوار .**

**٢ـ بەهۆی ئامرازی دانەپاڵ:**

کاتێك دوو وشە بەهۆی ئامرازی دانەپاڵ لێکدەدرێن، ئەوە ئامرازەکانی دانەپاڵ بۆ نێر و مێ و تاك و کۆ جیاوازییان لە نێواندا هەیە، بەمشێوەیە:

اـ ئامرازی دانەپاڵی (ا) بۆ تاکی مێ بەکاردێت، وەك:

**ـ کچا نەسرینێ هات .**

ب ـ ئامرازی دانەپاڵی (ێ) بۆ تاکی نێر بەکاردێت، وەك:

**ـ کوڕێ ئازادی زیرەکە .**

ج ـ ئامرازی دانەپاڵی (ێد، ێن، ێت) بۆ کۆی نێر و مێ بەکاردێت، وەك:

**ـ چیایێت کوردستانێ بڵندن .**

**٣ـ بەهۆی جێناو:**

**اـ جێناوی کەسی سەربەخۆ :**

لە کەسی سێیەمی تاکدا، لە کۆمەڵی (من - مە) جیاوازی لە نێوان نێر و مێدا دەکرێت، بەمشێوەیە:

وی/ جێناوی سەربەخۆیە بۆ کەسی سێیەمی تاکی نێر، وەك:

**- وی نان خوار.**

وێ/ جێناوی سەربەخۆیە بۆ کەسی سێیەمی تاکی مێ، وەك:

**- وێ نان خوار.**

**ب - جێناوی نیشانە:**

لە کرمانجی سەرووی زمانی کوردیدا، حەوت جێناوی نیشانەمان هەیە، کە بۆ تاك، کۆ، نێر، مێ، نزیك، دوور بەکاردەهێنرێت، جێناوەکانیش بەمشێوەیەی خوارەوەن[1]:-

**ئەڤە ——— بۆ تاکی نزیك بەکاردێت.**

**ڤی ——— بۆ تاکی نێری نزیك بەکاردێت.**

**ڤێ ——— بۆ تاکی مێی نزیك بەکاردێت.**

**وی ——— بۆ تاکی نێری دوور بەکاردێت.**

**وێ ——— بۆ تاکی مێی دوور بەکاردێت.**

**(ئەڤان) ڤان ——— بۆ کۆی نێر و مێی نزیك بەکاردێت.**

**(ئەوان) وان ——— بۆ کۆی نێر و مێی دوور بەکاردێت.**

**- ئەڤە پسمامێ منە.**

**- ڤی نەکرە[1].**

---

[1] - لێژنەیەك لە وەزارەتی پەروەردە، زمان و ئەدەبی کوردی، پۆلی هەشتەمی بنەڕەتی، چاپی سێیەم، چاپخانەی ئەکاسیا، هەولێر، ٢٠٠٩، ل ٨٢ — ٨٣.

**- ئەڤە هەڤالی منە .**

**- ڤی نان خارد .**

**- ڤێ نان خارد .**

**- وی چیرۆك نڤیسی .**

**- وێ چیرۆك نڤیسی .**

**- ڤان گۆڤەندەکا خۆش گرێدا .**

**- وان ڕەشبەلەك گرێدا .**

**٤ـ ئاوەڵناوی نیشانە:**

له کرمانجی سەرووی زمانی کوردیدا فۆرمەکانی ئاوەڵناوی نیشانە لەگەڵ ناوی تاك و کۆ و نێر و مێ بەشێوەی جیاواز بەکاردێن، بەمشێوەیەی خوارەوەن:

**ئەڤ..... ە ـــــــ لەگەڵ ناوێك بۆ تاکی نێر و مێی نزیك بەکاردێ.**

**ڤی..... ی ـــــــ لەگەڵ ناوێك بۆ تاکی نێری نزیك بەکاردێ.**

**ڤێ .....ێ ـــــــ لەگەڵ ناوێك بۆ تاکی مێی نزیك بەکاردێ.**

**وی.....ی ـــــــ لەگەڵ ناوێك بۆ تاکی نێری دوور بەکاردێ.**

**وێ..... ێ ـــــــ لەگەڵ ناوێك بۆ تاکی مێی دوور بەکاردێ.**

**ڤان(ئەڤان)..... ان ـــــــ لەگەڵ ناوێك بۆ تاکی نێر و مێی نزیك بەکاردێ.**

**وان(ئەوان) .....ان ـــــــ لەگەڵ ناوێك بۆ کۆی نێر و** مێی دوور بەکاردێ.

---

[1] ـ صادق بهاءالدین ئامێدی، ڕێزمانا کوردی – کرمانجی یا ژۆری و ژێری یا هەڤبەرکری، چاپا یەکێ، زانکۆی سەلاحەدین، دار الشؤون الثقافیة العامة، ١٩٨٧، ل ١٣٧ .

- ئەڤ کتێبە یێ مەیە.

- ڤی خورتی سەرێ مە بلند کر .

- ڤێ قوتابییێ وانە باش خواند .

- وی ڕەزڤانی ڕەزێ خۆ فرۆت .

- وێ گۆتنێ دلێ مە خۆشکر.

- ڤان گولان بچینە .

- وان جوتیاران زەڤیێن خۆ کێلان .

**٤ـ٤:جێناو**

لە زمانی کوردیدا جگە لە زاراوەی جێناو، هەندێ جار زاراوەکانی (ڕاناو، بۆناو، جێناڤ، بەرناو، بەرناڤ، زەمیر... هتد) بەکاردێت، کە هەر هەموویان هەمان مەبەست و واتا دەگەیەنن.

جێناو بەشێکە لە بەشەکانی ئاخاوتن، کە لە جێی یان جێگەی ناوی کەسێك یان شتێك دێت و بەکاردێت، واتە دەبێتە جێگرەوەی ناو.

**جێناوی کەسی**

واتای کەسی گیاندار دەگرێتەخۆ، کە ئەوانیش قسەکەر و گوێگرو نائامادە دەگرێتەوە، جێناوە کەسیەکانیش دوو جۆرن:

أ. **جێناوی کەسی سەربەخۆ:**

ئەو جێناوانە دەگرێتەوە، کە لە ڕواڵەتدا سەربەخۆن و واتای کەسی گیاندار دەگەیەنن، هەروەها واتای کەسەکە یان کەسەکان نیشان دەدەن و پەیوەندییان بە کەسانی دیکەوە ڕوون دەکەنەوە.

لە کرمانجی سەرووی زمانی کوردیدا دوو کۆمەڵە جێناو هەن، کۆمەڵەی (ئەز - ئەم) و کۆمەڵەی (مـن - مـە)، بەکارهێنانی ئەم دوو کۆمەڵەیە بەم دوو شێوەیەی خوارەوەیە :-

١ـ کۆمەڵەی (ئەز - ئەم) لەگەڵ کاری تێپەڕ و تێنەپەڕ بەکاردێت، بەمشێوەیەی خوارەوە[1]:

---

[1] ـ ئیبراهیم ڕەمەزان زاخۆیی، ڕێزمانا کوردی، دەزگای سپیریز بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە، دهۆك، چاپخانەی خانی، ٢٠٠٨، ل٧٨.

| کەسەکان | تاك | کۆ |
|---|---|---|
| یەکەم | ئەز | ئەم |
| دووەم | تۆ | هوون (هوین) |
| سێیەم | ئەو | ئەو (ئەوان) |

بۆ کاری تێنەپەڕ، ئەرکی بکەر دەبینێ، وەك :

- **ئەز هاتم .**

- **ئەز دێ هێم .**

لەگەڵ کاری تێپەڕیش دێت، لەم حاڵەتەشدا ئەرکی بکەر یان بەرکاری ڕاستەوخۆ دەبینێ :

- **ئەز دێ دارێ چینم .**

**بکەر**

- **ئەز تە دبینم .**

**بکەر**

- **وان هون دیتن .**

**بکەر**

- **دوژمنێ ئەز گرت .**

**بەرکاری ڕاستەوخۆ**

- **ئەز دکەم .**

- **تو دکەی .**

ـ ئەو دکەت .

ـ ئەم دکەین .

ـ هون دکەن .

ـ ئەوان دکەن .

لە کرمانجی سەرووی زمانی کوردیدا بۆ جیاکردنەوەی جێناوی (ئەو)ی کەسی سێیەمی تاك و جێناوی (ئەو)ی کەسی سێیەمی کۆ، ئەوە بەهۆی جێناوە لکاوەکانەوە لەنێو ڕستەدا جیادەکرێنەوە، بەمشێوەیەی خوارەوە:

ـ ئەو دهێت .

ـ ئەو دهێن .

لە نموونەی یەکەمدا جێناوی (ئەو) جێناوی سەربەخۆیە بۆ کەسی سێیەمی تاك، چونکە لەگەڵ جێناوی لکاوی (ت)ی کەسی دووەمی تاك بەکارهاتووە، بەڵام لە نموونەی دووەمدا، (ئەو) جێناوی سەربەخۆیە بۆ کەسی سێیەمی کۆ، چونکە لەگەڵ جێناوی (ن)ی کەسی سێیەمی کۆ بەکارهاتووە[1].

٢ـ کۆمەڵەی (من ـ مە)، تەنیا لەگەڵ کاری تێپەڕ بەکاردێ و ئەرکی بکەر دەبینێ، جێناوەکانی ئەم کۆمەڵەیەش بەم شێوەیەی خوارەوەن[2]: ـ

| کەسەکان | تاك | کۆ |
|---|---|---|
| یەکەم | من | مە |
| دووەم | تە | وە |
| سێیەم | وی ـ وێ | وان |

[1] ـ عەبدولسەلام نەجمەدین و سەلوا فەریق، ڕێزمانا کوردی بۆ زارۆکان، دەزگای سپێرێز، چاپخانەی حاجی هاشم، هەولێر، ٢٠١٠، ل ٦٥.

[2] ـ ئیبراهیم ڕەمەزان، هەمان سەرچاوە، ل ٧٩ ـ ٨٠ .

- من نڤیسی .
- وی/ ویَ نڤیسی .
- من گۆت .
- وی گۆت[1].

**ب ـ جێناوی کەسی لکاو:**

بەو جێناوانە دەوترێت، کە لە ڕواڵەتدا سەربەخۆ نین، بەڵکو بەشێوەیەکی لکاو بە کارێك یان ناوێك دەلکێن. ئەم جێناوانە لە ئاخاوتن و نووسیندا شوێن و جێگەی جێناوە کەسییە سەربەخۆکان دەگرنەوە. ئەو جێناوانە بە تەنیا هیچ مەبەستێك نە لە ئاخاوتن و نە لەنووسیندا بەدەستەوە نادەن، بەڵام کە لکان بە وشەکانی پێش خۆیانەوە، ئینجا مەبەست دەپێکن.[2]

لە کرمانجی سەرووی زمانی کوردیدا تەنیا یەك کۆمەڵە جێناوی کەسی لکاومان هەیە و بەشێوەیەکی ناچالاکیش بەکاردێت، کە بەمشێوەیە[3]:

| کەسەکان | تاك | کۆ |
|---|---|---|
| یەکەم | م | ین |
| دووەم | ی | ن |
| سێیەم | ە، Ø،ت | ن |

[1] ـ ساموێل ئودلی رەی، زمانێ کوردی – دۆکێ هەکاریا – گرامەر – فەرهەنگ، و: ڕۆژان حازم، دەزگای سپیرێز، چاپخانەی حاجی هاشم، هەولێر، ۲۰۰۷، ل ٤٨.

[2] ـ لیژنەیەك لە وەزارەتی پەروەردە، زمان و ئەدەبی کوردی، پۆلی دووەمی ناوەندیی، چاپخانەی ئارام، بەغدا، ۲۰۰۷، ل ٤٥.

[3] ـ محمد طاهر گوهەرزی، ڕێزمانا کوردی ـ زارێ کرمانجی، چاپخانەی خەبات، دهۆك، ۱۹۹۹، ل ۷۷.

وەكو:

- من دەستێ وی گرت .

- تە جۆت كر.

- مەمۆ من دبە.[1]

## جێناوی نیشانە

بەو جێناوانە دەوترێت كە لە جێی ناوی كەسێك یان شتێك بدادەنرێت و دەست نیشانی دەكەن.

لە كرمانجی سەرووی زمانی كوردیدا، حەوت جێناوی نیشانەمان هەیە، كە بۆ تاك، كۆ، نێر، مێ، نزیك، دوور بەكاردەهێنرێت، جێناوەكانیش بەمشێوەیەی خوارەوەن[2]:—

**ئەڤە ——— بۆ تاكی نزیك بەكاردێت .**

**ڤی ——— بۆ تاكی نێری نزیك بەكاردێت .**

**ڤێ ——— بۆ تاكی مێی نزیك بەكاردێت .**

**وی ——— بۆ تاكی نێری دوور بەكاردێت .**

**وێ ——— بۆ تاكی مێی دوور بەكاردێت .**

**(ئەڤان) ڤان ——— بۆ كۆی نێر و مێی نزیك بەكاردێت .**

**(ئەوان) وان ——— بۆ كۆی نێر و مێی دوور بەكاردێت .**

---

[1] ـ ڕەشید كورد، رێزمانا زمانێ كورمانجی، و : ئیسماعیل تاها شاهین، دەزگای سپیرێز، چاپخانەی خانی، دهۆك، ٢٠٠٨، ل٧٣ .

[2] ـ لێژنەیەك لە وەزارەتی پەروەردە، زمان و ئەدەبی كوردی، پۆلی هەشتەمی بنەڕەتی، چاپی سێیەم، چاپخانەی ئەكاسیا، هەولێر، ٢٠٠٩، ل ٨٢ — ٨٣ .

- ئەڤە پسمامێ منە.
- ڤی نەگرە [1].
- ئەڤە هەڤاڵی منە .
- ڤی نان خارد .
- ڤێ نان خارد .
- وی چیرۆك نڤیسی .
- وێ چیرۆك نڤیسی .
- ڤان گۆڤەندەکا خۆش گرێدا .
- وان ڕەشبەلەك گرێدا .

## جێناوی خۆیی

جۆرێکە لە جۆرەکانی جێناو لە ڕووی واتاوە، کە خاوەنییەتی و خاوەنداری دەگەیەنێت.

لە کرمانجی سەرووی زمانی کوردیدا، دوو فۆرم بۆ جێناوی خۆیی بەکاردێت، کە ئەوانیش (خۆ — خوە)، کە بە تەنیا بەکاردەهێنرێت و جێناوی لکاوی ناخرێتە سەر، وەکو [2]:-

- ئەز ب خۆ هاتم.
- من خۆ شوشت.

---

[1] - صادق بهاءالدین ئامێدی، ڕێزمانا کوردی — کرمانجی یا ژوری و ژێری یا هەڤبەرکری، چاپا یەکێ، زانکۆی سەلاحەدین، دار الشؤون الثقافیة العامة، ١٩٨٧، ل ١٣٧ .

[2] - لێژنەیەك لەوەزارەتی پەروەوردە، زمان و ئەدەبی کوردی، پۆلی یازدەهەمی ئامادەیی، چاپی چوارەم، چاپخانەی (مستقبل)، لوبنان، ٢٠١٠، ل٣٠ .

**ـ هەم ئەهلی ئەزەر نەبێن کو کورمانج**

**ئیشقی نەکرن ژبۆ خوە ئامانج**

**ـ ماسیڤان تۆرا خوە ئاڤێتە بن بەحرێ .**[1]

## جێناوی هەیی

جۆرێکە لە جۆرەکانی جێناو لە ڕووی واتاوە، کە واتای خاوەنداریەتی دەگەیەنێ و، خاوەنەکەشی دەشێ ناو یان جێناو بێ و لەنێو ڕستەدا ئەرکی ناوەکە یان جێناوەکەی پێ دەسپێردرێ.

لە کرمانجی سەرووی زمانی کوردیدا، سێ فۆرم بۆ جێناوی هەیی بەکاردێت، کە بۆ نێر، مێ، تاك، کۆ بەکاردێت، بەم شێوەیەی خوارەوەن[2]:ـ

(یێ) ئێ ـــــ بۆ تاکی نێر بەکاردێ .

(یا) ئا ـــــ بۆ تاکی مێ بەکاردێ .

(یێن) ئێن ـــــ بۆ کۆی نێر و مێ بەکاردێن .

**ـ ئەڤ کتێبە (یێ) ئێ منە .**

**ـ ئەڤ کتێبە (یا) ئا منە .**

**ـ ڤان کتێبێن (یێن) ئێن منە .**

---

[1] ـ ك. ك. کوردۆییڤ، ڕێزمانی کوردی، ل٣٣١.

[2] ـ أ ـ ڕەشید کورد، ڕێزمانا زمانێ کورمانجی، ل٧٨ .

ب ـــ لێژنەیەك لەوەزارەتی پەروەردە، زمان و ئەدەبی کوردی، پۆلی یازدەهەمی ئامادەیی، ل ٣٦ ـــ ٣٧ .

## جێناوی هاوبەش

بەو جێناوانە دەوترێ، کە هاوبەشی لەنێوان دووکەس یان دوو شت دروست دەکات. لە کرمانجی سەرووی زمانی کوردیدا، یەك فۆرم بۆ جێناوی هاوبەش بەکاردێت، کە ئەویش (هەڤ)ە،[1] زۆربەی جاریش ئەم جێناوە لەگەڵ (ژ، ل) دێت.

- **زارۆ ل هەڤ درن.**
- **پەیام ژ هەڤ دنڤیسین .**
- **ئەسپ و زین ب هەڤرا هاتنە دزین .**
- **ئانکۆ بچویك و مەزنا ب هەڤرا سەرهلدا .**

## جێناوی نەرێنی (نەفی)

بەو جێناوانە دەوترێت کە نەرێنی کەسێك یان شتێك ڕادەگەیەنن. لە کرمانجی سەرووی زمانی کوردیدا، کۆمەڵێ فۆرم بۆ جێناوی نەرێنی بەکاردێ، کە بریتین لە: (هیچ، چ، تو، قەت)، وەکو:-

- **لێ قەت نێچیر ڕاستی وی نەهاتن[2] .**

## جێناوی چەندێتی

بەم جێناوانە دەوترێت کە ڕێژەی کەسەکان یاخود شتەکان دیاری دەکات و واتای چەندێتی و پرسیار دەبەخشێ. لە کرمانجی سەرووی زمانی کوردیدا، شەش

---

[1] - ڕەشید کورد، هەمان سەرچاوە، ل٧٦ .

[2] - د. ئەورەحمانی حاجی مارف، ڕێزمانی کوردی، بەرگی یەکەم (وشەسازی)، بەشی دووەم (جێناو)، ل ٢٨١ – ٢٨٢ .

فۆرم بۆ جێناوی چەندێتی بەکاردێت، کە ئەمانەن[1]: (چەند، هنەك، هندەك، چقاس، ئەڤقاس، ئەوقاس... هتد). وەکو:

**- هندەك چوون.**

**- یەك بوو ئەلیف یەك نوقگە کر**

**چەند شکلێ دی لێ زێدەکر**

## جێناوی دیار

بەو جێناوانە دەوترێت کە ژمارەی کەسەکان یان شتەکان لە ڕستە و دەقدا دیاری دەکەن. بە واتایەکی تر ئەو وشانە دەگرێتەوە، کە لە جێگەی کەسێکی دیارو ئاشکرا و زانراو بەکاردێن.

لە کرمانجی سەرووی زمانی کوردیدا، کۆمەڵێ فۆرم بۆ جێناوی دیار بەکاردێن، لەوانە: (هەرتشت، گشکن تەڤ، تەمام، ... هتد )[2]

**- تەڤ قوتابیێن ئامادەن .**

## جێناوی نادیار

ئەو جێناوانە دەگرێتەوە، کە لە بری ناوی کەسێك یا گیاندارێك یا هەر شتێکی تر بەکار دەهێنرێت، بەڵام ئەم ناوە بەئاشکرایی دیار نییە کە کێیەو چییە، بە واتایەکی تر بەو جێناوانە دەوترێت کە لە شوێنی کەسێك یان شتێکی نادیار دێن.

---

[1]- د. ئەورەحمانی حاجی مارف، جێناو، ل ٢٧٦ — ٢٧٧ .

[2]- د. ئەورەحمانی حاجی مارف، جێناو، ل ٢٨٥ .

لە کرمانجی سەرووی زمانی کوردیدا، کۆمەڵێ فۆرم بۆ جێناوی نادیار دانراون، لەوانە: (کەس، تشت، گەسەك، تشتەك، هندەك، فلان، پێهڤان، ...)[1].وەکو:

**- کەس دڤێرێ ڕا نەچوویە بازێری[2].**

## جێناوی پرسیار

بەو جێناوانە دەوترێ کە پرسیار لە کەسێك یان شتێك یا کاتێك یاخود ڕووداوێك دەکەن. لە کرمانجی سەرووی زمانی کوردیدا کۆمەڵێ جێناو بۆ مەبەستی پرسیاری بەکاردێت، کە ئەمانەن[3]:(کی، چە، کێهە، کێهان، کیژان، چەوا، چاوا، کەنگینێ، کانێ، چەنگ،....).وەکو:

**- کی دبێژیت ئەز نەشێم بەرەڤانی یاخو بکەم ؟**

**- ئەو چ کەسە ل دیوانێ ڕونشتی ؟**

## جێناوی لێکدەر

ئەو جێناوانە دەگرێتەوە کە لە جیاتی ناوی کەسێك یان شتێك بەکاردەهێنرێت، کە پێشتر گوترابێ، هەروەها دوو ڕستەش پێکەوە دەبەستێت و بەیەکەوە ڕستەیەکی ئاڵۆز (تێکەڵ) سازدەکەن، هەمیشە جێناوی لێکدەر وەکو کەرەسەیەکی پەیوەستدار بە پاڕستەی نێو ڕستەکە هەژمار دەکرێت، چونکە ڕستەی ئاڵۆز لە شاڕستە و پاڕستە پێك دێت.

[1]- صادق بهاءالدین ئامێدی، ل ٢٦٣ – ٢٦٤ .

[2]- لێژنەیەك لەوەزارەتی پەروەردە، زمان و ئەدەبی کوردی، پۆلی دەیەمی ئامادەیی، چاپی چوارەم، چاپخانەی مستقبل، لوبنان، ٢٠١٠، ل ٥٢ .

[3]- صادق بهاءالدین ئامێدی، هەمان سەرچاوە، ل ٢٥٣ – ٢٥٦ .

لە کرمانجی سەرووی زمانی کوردیدا، یەك فۆرم بۆ جێناوی لێکدەر بەکاردێت، کە شارستە و پارستە دەخاتە پاڵ یەکتری و بەهۆیەوە ڕستەیەکی ئاڵۆز دروست دەکات، ئەم فۆرمەش (کو)ە . وەکو:

**- مە ئەو دیت کو دکەنی .**

**- من شڤان دیت کو ژ ترسان دلەرزی[1].**

[1] - لێژنەیەك لەوەزارەتی پەروەردە، زمان و ئەدەبی کوردی، پۆلی یازدەهەمی ئامادەیی، ل٦ .

## ٤ـ٥ : ئاوەڵناو

لە زمانی کوردیدا1 جگە لە زاراوەی ئاوەڵناو، ئەوە زاراوەکانی (هاوەڵناو، هەڤلناڤ، هاوەڵناڤ، سیفە .....) بەکاردێن. ئاوەڵناویش بەشێکە لە بەشەکانی ئاخاوتن، کە وەسفی ناوێك یاخود جێناوێك دەکات، بەهۆیەوە دەبێتە تەواوکەری ناو یان جێناو یان ئاوەڵناوێکی تر یان تەواوکەری کارێکی ناتەواو.

ئاوەڵناو لە ڕستەدا پەیوەستە بە ناو و جێناوەوە، واتە دۆست و هاوڕێی ناو و جێناوە. ئاوەڵناویش هەروەکو ناو و ئاوەڵکار هیچ نیشانەیەکی مۆرفۆلۆژی نییە، بۆ ئەوەی لە ڕووی ڕوخسارەوە دیاری بکرێت، بەڵکو دیاریکردنی ئاوەڵناو لە ڕستەدا پەیوەستە بە واتاوە.

### ئاوەڵناوی چۆنیەتی

بەو ئاوەڵناوانە دەوترێت کە چۆنیەتی خاسیەت و نیشانە دەگەیەنێ، لەگەڵ ئەوەشدا ئاوەڵناوی چۆنیەتی هەمەجۆرە، لەوانە واتای ڕەنگ نیشان دەدات (زەرد، شین سوور، سپی...)، چەمکی دەوروبەر ڕادەگەیەنێ (ڕاست، چەپ...)، یاخود سیفەت نیشان دەدات (ڕەزیل، ڕووخۆش...)، یاخود شێوە دەردەبڕێ (قەڵەو، پان، بەرین، لاواز....).

- **تریێ ڕەش بکڕە .**
- **گۆتنا خۆش بهارا دلانە .**
- **شرین کچەکا نازدارە .**

## ئاوەڵناوی نیشانە

بەو ئاوەڵناوانە دەوترێت کە دەستنیشانی ناوی کەسێك یان شتێك یان زیاتر لە ڕستەدا دەکەن. ئاوەڵناوەکانی نیشانە هەمیشە دەبنە دوو پارچە، پارچەیەکیان دەکەوێتە پێش ناوەکە و پارچەکەی تریان دەکەوێتە دوای ناوەکە، ئەم دوو پارچەیە دەبنە دیارخەر بۆ ناوەکە، هەر بۆیەشە هەر ناوێك بە ئاوەڵناوی نیشانە دەستنیشان بکرێت، ئەوا دەبێتە ناوێکی ناسراو.

لە کرمانجی سەرووی زمانی کوردیدا فۆرمەکانی ئاوەڵناوی نیشانە بەمشێوەیەی خوارەوەن:

ئەڤ..... ە ـــــــــ لەگەلّ ناوێك بۆ تاکی نێر و مێی نزیك بەکاردێ.

ڤی..... ی ـــــــــ لەگەلّ ناوێك بۆ تاکی نێری نزیك بەکاردێ.

ڤێ .....ێ ـــــــــ لەگەلّ ناوێك بۆ تاکی مێی نزیك بەکاردێ.

وی.....ی ـــــــــ لەگەلّ ناوێك بۆ تاکی نێری دوور بەکاردێ.

وێ..... ێ ـــــــــ لەگەلّ ناوێك بۆ تاکی مێی دوور بەکاردێ.

ڤان(ئەڤان)..... ان ـــــ لەگەلّ ناوێك بۆ تاکی نێر و مێی نزیك بەکاردێ.

وان(ئەوان) .....ان ـــــــ لەگەلّ ناوێك بۆ کۆی نێر و مێی دوور بەکاردێ.

- ئەڤ کتێبە یێ مەیە.
- ڤی خورتی سەرێ مە بلند کر .
- ڤێ قوتابییێ وانە باش خواند .
- وی ڕەزڤانی ڕەزێ خۆ فرۆت .
- وێ گۆتنێ دلێ مە خۆشکر .
- ڤان گولان بچینە .
- وان جوتیاران زەڤیێن خۆ کێلان .

دەتوانین بەم شێوەیەی خوارەوە بەراورد لە نێوان جێناوی نیشانە و ئاوەڵناوی نیشانە بکەین :

| جێناوی نیشانە | ئاوەڵناوی نیشانە |
| --- | --- |
| ١- جۆرێکە لە جۆرەکانی جێناو لە ڕووی واتاوە . | ١- جۆرێکە لە جۆرەکانی ئاوەڵناو لە ڕووی واتاوە. |
| ٢-هەموو ئەرکەکانی ناو دەبینێ (بکەر، بەرکاری ڕاستەوخۆ، بەرکاری ناڕاستەوخۆ، نیهاد، گوزارە....). | ٢- تەنیا ئەرکی دیارخەری ناو دەبینێ. |
| ٣- هەمیشە لە جێی ناو دێ. | ٣- هەمیشە لەگەڵ ناو دێ، بە هۆیەوە ناوەکەش دەبێتە ناوێکی ناسراو . |
| ٤- لە ناو ڕستەدا لە شێوەی یەك پارچە دێ. | ٤- لە ناو ڕستەدا ئاوەڵناوی نیشانە دەبێتە دوو پارچە، پارچەیەکیان دەکەوێتە پێش ناو و پارچەکەی تریان دەکەوێتە دوای ناوەکە. |

**ئاوەڵناوله ڕووی پلەوە**

**أ. ئاوەڵناوی پلەی چەسپاو:**

ئەو ئاوەڵناوانە دەگرێتەوە کە بەراورد لە نێوان هیچ کەس و شتێك ناکەن، بەڵکو تەنیا پلەی نەگۆڕ و چەسپاوی ناوەکە یاخود جێناوەکە دەخاتە ڕوو، واتە تەنیا وەسفی ناوەکە یاخود جێناوەکە دەکات و، دەبێتە تەواوکەری ناو یان جێناو یان کاری ناتەواو، وەکو (باش، خراپ، جوان، زیرەك، ئازا، خێرا، ....).

- **جلکێن جوان بکرە .**
- **ئاڤا پاقژ ڤەخۆ .**

**ب. ئاوەڵناوی پلەی بەراورد:**

ئەو ئاوەڵناوانە دەگرێتەوە کە بەراورد لە نێوان دوو کەس یان دوو شت دەکەن، بە جۆرێك یەکێکیان بە باشتر و چاکتر دادەنێ لە ئەویتریان، یاساکەی بەم شێوەیە:

**چەسپاو + تر = ئاوەڵناوی پلەی بەراورد**

باش + تر = باشتر

چاك + تر = چاکتر

زیرەك + تر = زیرەکتر

- **نەسرین ژ نەرمینێ زیرەکترە .**

**ج. ئاوەڵناوی پلەی باڵا:**

ئەو ئاوەڵناونە دەگرێتەوە، کە بەراورد لە نێوان کەسێك لەگەڵ کۆمەڵە کەسێك یان شتێك لەگەڵ کۆمەڵە شتێك دەکەن.

دەستوورەکانی بەم شێوەیەی خوارەوەیە:

**١. چەسپاو + ترین = ئاوەڵناوی پلەی باڵا**

باش + ترین = باشترین

چاك + ترین = چاکترین

**٢. بەراورد + ین = ئاوەڵناوی پلەی باڵا**

باشتر + ین = باشترین

چاکتر + ین = چاکترین

**- دلۆڤان زیرەکترین قوتابییە دڤێ پۆلیدا .**

**٣. لە هەموو، لە گشت، لە تێکڕا + بەراورد = ئاوەڵناوی پلەی باڵا**

**- ئاواز لە هەموو کچەکان جوانترە.**

**٤. هەمی + چەسپاو = ئاوەڵناوی پلەی باڵا**

**- نەرمین ژ هەمی قوتابیان هێمنترە .**

## ٦ـ٤: کار

کار بەشێکە لە بەشەکانی ئاخاوتن، کە ڕوودان و کاتی تێدایە، مەبەست لە ڕوودانەکە، ئەوەیە کە شتێك ڕوویدابێ یان ئەنجام درابێ، مەبەستیش لە کات، ئەوە کاتی ڕانەبوردوو و ڕابوردوو دەگرێتەوە[1].

### کاری ڕابوردوو

ئەو کارەیە، کە ڕوودانەکەی دەکەوێتە پێش ئاخاوتنەوە، واتا ڕوودانی کارەکە بەسەر چووە و ڕوویداوە ((کرداری ڕابوردوو ئەو کردارەیە، کە پرۆتسێسی ڕوودانەکەی پێش ئاخاوتن بکەوێ))[2]. لە زمانی کوردیدا بۆ سازکردنی کاری ڕابوردوو، پەنادەبرێتە بەر چاوگ، ئەمیش بەلابردنی (ن)ی چاوگ ساز دەبێت ((لە زمانی کوردیدا فرمانی ڕابوردوو بە لابردنی (ن)ی چاوگ دروست دەکرێت))[3]، لەم حاڵەتەشدا کاری ڕابوردووی نزیك دروست دەبێت، کە بە یەکێك لەم پێنج مۆرفیمە(وو، ی، د، ا، ت) کۆتاییان دێت:

---

(١) بۆ شارەزا بوون لەم بابەتە، بگەڕێوە بۆ: ئەورەحمانی حاجی مارف (د)، ڕێزمانی کوردی، بەرگی یەکەم (وشەسازی)، بەشی پێنجەم (کردار)، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی، ٢٠٠٠.

(٢) د ئەوڕەحمانی حاجی مارف، کردار، ل٢٠٠.

(٣) عبدالله شالی، ڕابەری قوتابیان بۆ چاوگ و بۆ فرمان، چاپی یەکەم، چاپخانەی( دار الجاحظ)، ١٩٧٦، بەغدا، ل٤.

مۆرفێمی (وو) :

| چاوگ | لابردنی (ن) | کاری ڕابوردوو | مۆرفێمی ڕابوردوو |
|---|---|---|---|
| چوون | - ن | چوو | وو |
| بوون | - ن | بوو | وو |
| دروون | - ن | دروو | وو |
| چوون | - ن | چوو | وو |

مۆرفێمی (ی) :

| چاوگ | لابردنی (ن) | کاری ڕابوردوو | مۆرفێمی ڕابوردوو |
|---|---|---|---|
| کڕین | - ن | کڕی | ی |
| فڕین | - ن | فڕی | ی |
| بڕین | - ن | بڕی | ی |
| سڕین | - ن | سڕی | ی |

مۆرفێمی (د) : —

| چاوگ | لابردنی (ن) | کاری ڕابوردوو | مۆرفێمی ڕابوردوو |
|---|---|---|---|
| مردن | ـ ن | مرد | د |
| کردن | ـ ن | کرد | د |
| بردن | ـ ن | برد | د |
| خواردن | ـ ن | خوارد | د |

لە کرمانجی سەرووی زمانی کوردیدا لە زۆرینەی حاڵەتەکاندا فۆنیمی (د) لە نووسیندا تێدەچێت. وەك:

مرن - ن = مر

کرن - ن = کر

برن - ن = بر

خوارن - ن = خوار

مۆرفێمی (ا) :ـ

| چاوگ | لابردنی (ن) | کاری ڕابوردوو | مۆرفێمی ڕابوردوو |
|---|---|---|---|
| سووتان | - ن | سووتا | ا |
| ڕووخان | ـ ن | ڕووخا | ا |
| شکان | ـ ن | شکا | ا |
| ڕژان | ـ ن | ڕژا | ا |

مۆرفێمی (ت) :

| چاوگ | لابردنی (ن) | کاری ڕابوردوو | مۆرفێمی ڕابوردوو |
|---|---|---|---|
| کەوتن | ـ ن | کەوت | ت |
| خەوتن | ـ ن | خەوت | ت |
| شوشتن | ـ ن | شوشت | ت |
| نوستن | ـ ن | نوست | ت |

## * جۆرەکانی کاری ڕابوردوو

١. ڕابوردووی نزیك:

ئەو کارەیە، کە دەلالەت لەسەر ڕوودانی کارێك لە ڕابوردووی نزیکدا دەکات[1].

چاوگ — ن = ڕابوردووی نزیك

چوون — ن = چوو

برن — ن = بر

سووتان — ن = سووتا

کەوتن — ن = کەوت

مرن — ن = مر

٢. ڕابوردووی بەردەوام:

ئەو کارەیە، کە دەلالەت لەسەر ڕوودان و بەردەوامی کارێك لەکاتی ڕابوردوودا دەکات[2].

لە کرمانجی سەرووی زمانی کوردیدا تەنیا نیشانەی (د) وەکو نیشانەی ڕابوردووی بەردەوام بەکاردێت و دەکەوێتە بەشی پێشەوەی کارەکە، وەکو:

د + کەوت = دکەوت

**ـ ئەز دهاتم .**

**ـ من دگرت .**[3]

---

(١) نووری عەلی ئەمین، ڕێزمانی کوردی، چاپخانەی کامەران، سلێمانی، ١٩٦٠، ل٢٠٢.

٢ ـ هەمان سەرچاوە، ل ٢٢٣.

٣ ـ بانیز عمر احمد، تێنس لە دایالێکتی ژووری زمانی کوردیدا( گوڤەری بادینی)،دەزگای چاپ و بلاوکردنەوەی موکریانی،چاپخانەی خەبات، دهۆك، ٢٠٠٢،ل ١٦ .

**٣. ڕابوردووی دوور:**

ئەو کارەیە، کە دەلالەت لەسەر ڕوودانی کارێك لە ڕابوردووی دووردا دەکات[١].

ڕابوردووی نزیك + بوو = ڕابوردووی دوور

کەوت + بوو = کەوتبوو

خەوت + بوو = خەوتبوو

سووتا + بوو = سووتابوو

شکا + بوو = شکابوو

**٤. ڕابوردووی تەواو:**

ئەو کارەیە، کە دەلالەت لەسەر ڕوودانی کارێك لە ڕابوردوویەکی نەزۆر دوور و نەزۆر نزیکدا دەکات[٢].

ڕابوردووی نزیك + ( وە / یە ) = ڕابوردووی تەواو

( ووە / ییە)

کەوت + ییە = کەوتییە

سووتا + یە = سووتایە

ئەگەر کاری ڕابوردووی نزیك کۆتایی بە مۆرفیمەکانی (ت، د) هاتبێ، ئەوا بۆ کاری ڕابوردووی تەواو، مۆرفیمەکانی (ییە) وەردەگرێت، بەلام ئەگەر کاری

---

١ ـ هەمان سەرچاوە، ل ١١٦.

٢ ـ نووری عەلی ئەمین، قەواعیدی زمانی کوردی لە (صرف و نەحو)دا، بەرگی یەکەم، ١٩٥٦، چاپخانەی مەعارف، بەغدا، ل ١٧.

ڕابوردووی نزیك کۆتایی بە مۆرفیمەکانی (ا، وو، ی) هاتبێ، ئەوە مۆرفیمی (یە) وەردەگرن.

**- من گرتییە .**

**- وی نان خوارییە .**

**- ئەز کتێب کڕییە .**

بۆ نەرێ کردنی کاری ڕابوردوو، ئەوە نیشانەی (نە) وەردەگرێ، کە دەخرێتە سەر بەشی پێشەوەی کارەکە.

| ئەرێ | نەرێ |
|---|---|
| کەفت | نەکەفت |
| مر | نەمر |
| شکابوو | نەشکابوو |

## کاری ڕانەبوردوو

ئەو کارەیە، کە ڕوودانەکەی دەکەوێتە دوای ئاخاوتن، واتا کارەکە ڕووی نەداوە، یان ئێستا ڕوودەدات یان لە داهاتوودا . لە زمانی کوردیدا بۆ سازکردنی کاری ڕانەبوردوو، پەنا دەبرێتە بەر (ڕەگی ڕانەبوردوو) و، مۆرفێمی ئەرێی ڕانەبوردووش دەکەوێتە پێش ڕەگەکە و جێناوی لکاویش بە کارەکەوە دەنووسێت.

لە کرمانجی سەرووی زمانی کوردیدا، نیشانەی تایبەت و مۆرفۆلۆژیمان هەیە بۆ جیاکردنەوەی ڕانەبوردووی ئێستا لە ڕانەبوردووی داهاتوو، دەستورەکانیشیان بەمشێوەیەی خوارەوەیە:

**ڕانەبوردووی ئێستا: مۆرفێمی (د) + ڕەگی ڕانەبوردوو + جێناوی لکاو**

خوارن ← د + خۆ + م =دخۆم

شوشتن ← د + شۆ + م = دشۆم

نڤیسین ← د + نڤیس + م = دنڤیسم

**ڕانەبوردووی داهاتوو: مۆرفێمی (دێ) + ڕەگی ڕانەبوردوو + جێناوی لکاو**

خوارن ← دێ + خۆ + م =دێ خۆم

شوشتن ← دێ + شۆ + م = دێ شۆم

نڤیسین ← دێ + نڤیس + م = دێ نڤیسم

بۆ نەرێ کردنی کاری ڕانەبوردووش، ئەوە مۆرفێمی (نا) دەچێتە شوێنی (دە) لە کرمانجی ناوەڕاست و (د) و (دێ) لە کرمانجی سەروو و دەیکات بە نەرێ، وەك :

دەڕۆم ← ناڕۆم .

دچم ← ناچم .

دێ چم ← ناچم .

- **بەیانی دەچم بۆ بازاڕ .**
- **بەیانی ناچم بۆ بازاڕ .**
- **نووکە دچم .**
- **نووکە ناچم .**
- **پشتی نیڤەڕۆ دێ چم .**
- **پشتی نیڤەڕۆ ناچم .**

## کاری دارڕژاو

لە کرمانجی سەرووی زمانی کوردیدا، کۆمەڵێ پێشگر و پاشگر هەن، کە بەشداری لە سازکردنی کاری دارڕژاو دەکەن، لەوانە[1]:

١- (ڤـە)، ئـەم مۆرفیمـە وەك پێشـگر و پاشـگر بـەکاردێت و، واتـای دووپاتکردنـەوە دەگەیـەنێت، بەمشـێوەیە: (ڤـەخارن، ڤەکوشـتن، ڤـەکرن، ڤەشـاردن، ڕابووەڤـە، ڤەخارەڤە... هتد).

٢ــ (ــ ەڤـە) ئـەم پاشـگرە بەرانبـەر پاشـگری (ــ ەوە) لـە کرمـانجی ناوەڕاسـت دەوەستێ، وەك:

(هاتمەڤە، دچینەڤە،... هتد).

٣ـ اندن: ئەم پاشگرە ڕۆڵی تێپەڕاندن دەبینێ، وەك:

**کەفتن.........کەفتاندن**

**ڕزین.........ڕزاندن**

٤ـ (ڤێ ـ)، وەك: ( ڤێ کەفتن، ڤێ خستن، ڤێ گرتن... هتد).

٥ـ (هل ـ)، وەك: (هلدان، هلبـوون، هلکشـان، هلوەشـیان، هلوەشـاندن، هلکـولین... هتد).

٦ـ (هن ـ)، وەك: (هنگرتن، هنجنی، هنگافتن،... هتد)[2].

٧ـ (دا ـ)، وەك: (داچوون، داکەفتن، داشکاندن، دارشتن،... هتد).

٨ـ (ڕا ـ)، وەك: (ڕاهێنان، ڕاکەتن، ڕاهێشتن، ڕاپێچان، ڕاگەهاندن،...هتد).

٩ـ (وەر ـ)، وەك: (وەرگەڕان، وەرسوڕان، وەرگرتن،... هتد).

---

[1] ــ سەلوا فەریق سالح، کاری دارێژراو لەنێوان کوردی (دیـالێکتی ژوورو) و فارسـیدا، دەزگـای سـپیرێز، چاپخانەی خانی، دهۆك، ٢٠٠٩، ل ٣٤ ـ ٣٩.

[2] ــ فاضل عومەر، ئاورەك د زمانێ کوردی، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠٤، ل ٢٠٨.

١٠- (ڕوو -)، وەك: (ڕوودان، ڕووکرێ، ڕووکر،...هتد).

١١- (پێ -)، وەك: (پێ کەنین، پێ گەیشتن، پێ کەوتن...)[1].

١٢- (تێ -)، وەك: (تێ فکریم[2]، تێگەمشتن، تێگرتن، تێکرن،... هتد)[3].

١٣- (ژێ -)، وەك: (ژێ خوارن، ژێ دزین، ژێکرن،... هتد).

---

[1] – عەبدوڵڵا حوسێن ڕەسووڵ، مۆرفیمە ڕێزمانییەکانی کار، نامەی دکتۆرا، کۆلێژی پەروەردە (ئیبن ڕوشد)، زانکۆی بەغدا، ١٩٩٥، ل ٣٧.

[2] – هەمان سەرچاوە، ل ٤٠.

[3] – ئەورەحمانی حاجی مارف(د)، وشەڕۆنان لە زمانی کوردیدا، ل ٧٣.

## ٧ـ٤: ئاوەڵکار

لە زمانی کوردیدا جگە لە زاراوەی (ئاوەڵکار)، زاراوەکانی (ئاوەڵفرمان، ئاوەڵکار، ئادڤێرب، هاوەڵکار) بەکاردێن . ئاوەڵکاریش بەشێکە لە بەشەکانی ئاخاوتن، کە وەسفی کارێك دەکات لە ڕستەکەدا چونکە کات و شوێن و چۆنیەتی و چەندیەتی .....هتد کارەکە لە ڕستەدا دەستنیشان دەکات، ئاوەڵکار دۆست و هاوڕێی کارە، چونکە هەمیشە لەگەڵ کار دێت، واتە پەیوەستە بە کارەکەوە، ئەمەش پێچەوانەی ئاوەڵناوە، چونکە ئاوەڵناو دۆست و هاوڕێی ناو و جێناوە، کە بەهۆیەوە وەسفیان دەکات.

### ئاوەڵکاری کاتی

بەو ئاوەڵکارانە دەوترێ، کە کاتی ڕوودانی کارەکە دەستنیشان دەکات. لە کرمانجی سەرووی زمانی کوردیدا، وشەکانی (ئیرۆ، ئەڤرۆ/ئەڤرو، نها/ نهۆ، دوهی/ دوهێ، پێر، شەڤێ، سپێدێ، سبا، بەرێ، ئێڤارێ، ئیڤارا،... هتد) بەکاردێن، وەك:

**- ئەز سپێدەهیان وەرزشێ دکەم**[1].

### ئاوەڵکاری شوێنی

بەو ئاوەڵکارانە دەوترێت کە شوێنی ڕوودانی کارەکە دەست نیشان دەکەن، لە کرمانجی ناوەڕاستی زمانی کوردیدا، وشەکانی (نك، کن، ژوورێ، ب رەخ، ژێری، ل خوارێ، ژخارێ، بن، بنڕا، ڤڕا،... هتد) بەکاردێن، وەك:

**- کتێبی مە ل نك ڕزگاری بوو.**

---

[1] – عەبدولسەلام نەجمەدین و سەلوا فەریق، ڕێزمانا کوردی بۆ زارۆکان، ل ١٠٠.

### ئاوەڵکاری چۆنیەتی

بەو ئاوەڵکارانە دەوترێت کە چۆنیەتی ڕوودانی کارەکە دەستنیشان دەکەن، لە کرمانجی سەرووی زمانی کوردیدا، وشەکانی (ب لەز/ بلەز، ب جوانی، ب خۆشی، ب ژیری...هتد) بەکاردێت، وەکو:

**ـ ئەز بلەز چوومە ناڤ زانکۆیێ.**

### ئاوەڵکاری چەندێتی

بەو ئاوەڵکارانە دەوترێت کە چەندێتی ڕوودانی کاری ناو ڕستە دەستنیشان دەکەن. لە کرمانجی سەرووی زمانی کوردیدا، وشەکانی (فرە، پچێك/ پیچەك، کێم، گەلەك...هتد) بەکاردێت، وەکو:

**ـ ئازادی پیچەك نان خوار .**

### ئاوەڵکاری ڕێکخستن

بەو ئاوەڵکارانە دەوترێت کە شێوە و جۆری جێبەجێ کردنی کارەکە دەخاتەڕوو. لە کرمانجی سەرووی زمانی کوردیدا، وشەکانی (پێکڤە، ب گشتی، هێدی هێدی، کێم کێم، ئێك ئێك،... هتد) بەکاردێن، وەك:

**ـ ئەز هێدی هێدی چوومە ماڵ[1].**

---

[1] – عەبدولسەلام نەجمەدین و سەلوا فەریق، هەمان سەرچاوە، ل ١٠٢.

## ٤ـ٨: پێشبەند ( پریپۆزیشن )

بەشێکە لە بەشەکانی ئاخاوتن کە بەتەنیا بەکارنایەت، بەڵکو پێویستی بە کەرەسەی تر هەیە بۆ ئەوەی واتا ببەخشێت، ئەگەرچی پێشبەند لە بنچینەدا واتای شوێنی و ئاراستەکردن دەگەیەنێت،بەلام هەر واتا ناگەیەنێت. وەکو ئاماژەمان بۆی کرد، کە پێشبەند لە پێش ناوێك یان جێناوێك دێت، بۆ پیشاندانی پەیوەندی نێوان ئەو ناوە یان ئەو جێناوە لەگەڵ ناوێکی تری نێو ڕستەکەدا .

لە کرمانجی سەرووی زمانی کوردیدا، پێشبەند (پریپۆرزشین)ەکان بەمشێوەیەی خوارەوەن:

پێشبەندی (ل): ئەم پێشبەندە بەرانبەر بە (لە) لە کرمانجی ناوەڕاست دەوەستێ، وەك:

**ـ چیمەنتو ل ئاخ و بەرا چێدکەن[1].**

ئەم پێشبەندە لە شێوەی ناسادەشدا دەبینرێ، کاتێ لەگەڵ پاشبەندەکانی (دا، ڕا) دێت، وەك:

**ـ ل هەڤلێردا چوونە بوون.**

پێشبەندی(ژ): ئەم پێشبەندە بەرانبەر بە (لە) لە کرمانجی ناوەڕاست و (ل) لە کرمانجی سەروو دەوەستێ، وەك:

**ـ ڕۆژا بیت و یەکێ ژ هەیڤا سێێ جەژنا نەورۆزێ یە[2].**

پێشبەندی (ب): ئەم پێشبەندە بەرانبەر بە (بە) لە کرمانجی ناوەڕاست دەوەستێ و، لە شێوەی سادە و ناسادەدا دەبینرێ، وەك:

---

[1] – محەمەد تاهیر گوهەرزی، ڕێزمانا کوردی زاری کورمانجی، ل ١٥٤.

[2] – ئیبراهیم ڕەمەزان زاخۆیی، ڕێزمانا کوردی، ل ٦٣.

**ـ ب دەستێ خەلکی مار دگرە[1].**

**ـ ئەسپ و زین ب هەڤرا هاتنە دزین[2].**

پێشبەندی (بۆ): ئەم پێشبەندە بۆ دەست نیشانکردنی شوێن بەکاردێت و بەرانبەر بە (بـۆ) لـە کرمـانجی ناوەڕاست دەوەستێ، هـەروەها ئـەم پێشـبەندە زۆرجـاران شێوەی خۆی دەگۆڕێت و دەبێت بە (بو)، وەك:

**ـ کێ هەڕ و فراڤینێ بو مە بەرهەڤدکەت؟[3]**

وا ڕێکدەکەوێت پێشبەندی (بۆ / بو) لەگەڵ پێشبەندی (ژ) یەك دەگرن و قاڵبی (ژبۆ) دروست دەکەن[4]، وەك:

**ـ خەلك ژ بۆ ناڤێ سەرخوەبوونێ شەڕدکن[5].**

پێشبەندی (ە): ئەم پێشبەندە بەرانبەر بە پێشـبەندی (ە) لـە کرمـانجی ناوەڕاست دەوەستێ، وەك:

**ـ ماسیڤان تۆرا خوە ئاڤێتە بن بەحرێ[6].**

---

[1] – ك. ك. کوردۆییێڤ، ڕێزمـانی کـوردی بـە کەرەسـتەی دیـالێکتی کرمـانجی و سۆرانی، و: کوردستان موکریانی، هەولێر، ١٩٨٤، ل ٣٢٣.

[2] – ئازاد ئەمین فەرەج باخەوان، پێشبەند و پاشبەند لە هـەردوو دیالێکتی کرمـانجی خـواروو و ژووروو ی زمانی کوردیدا، نامەی دکتۆرا، بەشی کوردی، کۆلێژی پەروەردە (ئیبن ڕوشـد)، زانکـۆی بەغـدا، ٢٠٠٣، ل ١١١.

[3] – صادق بهاءالدین ئامێدی، ڕێزمانا کوردی، ل ٢٥٥.

[4] – ئازاد ئەمین باخەوان، هەمان سەرچاوە، ل ١٢١.

[5] – ك. ك. کوردۆییێڤ، ڕێزمانی کوردی بە کەرەستەی دیالێکتی کرمانجی و سۆرانی، ل ٣٣٥.

[6] – هەمان سەرچاوە، ل ٣٣١.

پێشبەندی (تا): ئەم پێشبەندە شێوەی تریشی هەیە و لە شێوەی (هەتا، حەتا، هەیانی، حەیا...) خۆی دەنوێنێ[1]، هەروەها ئەم پێشبەندە وەك پێشبەندی (تا)یە لە کرمانجی ناوەڕاست، وەك:

**- ل ڤی بایی دچوون حەیا شەڤ گهشتە وەختا نمێژا شیڤانە[2].**

پێشبەندی (بێ): - ئەم پێشبەندە بەرانبەر بە پێشبەندی (بێ)یە لە کرمانجی ناوەڕاست، وەك:

**- بێ پارە ئەز خورا ناگرم[3].**

---

[1] — ئازاد ئەمین باخەوان، هەمان سەرچاوە، ل ١٣١.

[2] — مەمێ ئالان، کۆکردنەوەی صالح عەلی گوللی، بەغدا، ١٩٧٧، ل ٦١.

[3] — صادق بهاءالدین ئامێدی، ڕێزمانا کوردی، ل ٤٢٧.

## ٤ـ٩: ئامرازی سەرسوڕمان و بانگهێشتکردن

**ئامرازی سەرسوڕمان:**

مەبەست لە ئامرازی سەرسوڕمان یاخود ڕستەی سەرسوڕمان ئەوەیە کە قسەکەر واتە کەسی یەکەم هەستی خۆی بەرانبەر دەوروبەر دەردەبڕێ، ئەم هەست دەربڕینەش بۆ هەردوو حاڵەتی خۆشی و ناخۆشی بەکاردێت.

مەبەست لە ڕستەی بانگکردن بەو ڕستانە دەوترێت، کە لایەنی بانگکردنی تێدایە، واتە ئامرازێك لە ئامرازەکانی بانگکردن یان نیشانەیەك لە نیشانەکانی بانگکردن دەبینرێ.

لە کرمانجی سەرووشدا، چەند نیشانەیەك بە ناو دەلکێت، بەهۆیەوە ڕەگەزی ناوەکە دیاری دەکرێت، نیشانەکانیش بریتین لە :

اـ نیشانەی (ۆ) بۆ تاکی نێر بەکاردێت، وەك:

**ـ کوڕۆ، بخوێنە داسەرکەڤی .**

ب ـ نیشانەی (ێ) بۆ تاکی مێ بەکاردێت، وەك:

**ـ خویشکێ، چێلێ بدۆشە .**

ج ـ نیشانەی (ینە) بۆ کۆی نێر و مێ بەکاردێت، وەك:

**ـ کوڕینە ڤان کاران نەکەن .**

## سەرچاوەکان

### یەکەم: بە زمانی کوردی


١ـ ئازاد ئەمین فەرەج باخەوان، پێشبەند و پاشبەند لە هەردوو دیالێکتی کرمانجی خواروو و ژووروی زمانی کوردیدا، نامەی دکتۆرا، بەشی کوردی، کۆلێژی پەروەردە (ئیبن روشد)، زانکۆی بەغدا، ٢٠٠٣.

٢ـ ئەحمەد هیرانی، سێ کێشەی ڕێزمانی لە زمانی کوردیدا و چارەیان ئەبێ چی بێ؟!، گ (کاروان)، ژ (١١٢ـ١١٣)، ١٩٩٧.

٣ـ ئەوڕەحمانی حاجی مارف (د)، ڕێزمانی کوردی، بەرگی یەکەم (مۆرفۆلۆژی)، بەشی یەکەم (ناو)، چاپخانەی کۆڕی زانیاری عێراق، بەغدا، ١٩٧٩.

٤ـ ئەوڕەحمانی حاجی مارف (د)، ڕێزمانی کوردی، بەرگی یەکەم (وشەسازی)، بەشی دووەم (جێناو)، دەزگای ڕۆشنبیری و بلاوکردنەوەی کوردی، بەغدا، ١٩٨٧.

٥ـ ئەوڕەحمانی حاجی مارف (د)، ڕێزمانی کوردی، بەرگی یەکەم (وشەسازی) بەشی سێیەم (ئاوەڵناو)، کۆڕی زانیاری عێراق/ دەستەی کورد، بەغدا، ١٩٩٢.

٦ـ ئەوڕەحمانی حاجی مارف (د)، ڕێزمانی کوردی، بەرگی یەکەم (وشەسازی)، بەشی چوارەم (ژمارە و ئاوەڵکردار)، دەزگای ڕۆشنبیری و بلاوکردنەوەی کوردی، بەغدا، ١٩٩٨.

٧ـ ئەوڕەحمانی حاجی مارف (د)، ڕێزمانی کوردی، بەرگی یەکەم (وشەسازی)، بەشی پێنجەم (کردار)، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی، ٢٠٠٠.

٨ـ ئەوڕەحمانی حاجی مارف (د)، وتاری کار بەپێی ڕۆنان و چەند سەرنجێك، گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ، ژمارە (١٣٩)، ١٩٩٧.

٩ـ ئەوڕەحمانی حاجی مارف (د)، فەرهەنگی زاراوەی زمانناسی، سلێمانی، ٢٠٠٤.

١٠ـ ئەورەحمانی حاجی مارف (د)، زمانی کوردی لەبەر ڕۆشنایی فۆنەتیکدا، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد، بەغدا، ١٩٧٦ .
١١ـ ئیبراهیم ڕەمەزان زاخۆیی، ڕێزمانا کوردی، دەزگای سپیرێز بۆ چاپ و بلاوکردنەوە، دهۆك، چاپخانەی خانی، ٢٠٠٨.
١٢ـ ئیدریس عەبدوللا، بزوێنی (ە) لە ئاستەکانی دەنگسازی و وشەسازی و ڕستەسازی، گۆڤاری ڕامان، ١٩٩٩.
١٣ـ بەکر عومەر عەلی(د) و شێرکۆ حەمە ئەمین (٢٠٠٧)، زار و شێوەزار، چاپی دووەم، چاپخانەی چوارچرا، سلێمانی.
١٤ـ تۆفیق وەهبی، دەستووری زمانی کوردی، جیزمی یەکەم، بەغدا، ١٩٢٩.
١٥ـ جەلادەت ئالی بەدرخان، ئەلفابێیا کوردی و بنگەهێن گرامەرا کورمانجی، ڤەگوهاستن ژ تیپێن لاتینی: مەسعود خالد گولی، چاپخانەی خەبات، دهۆك، ٢٠٠١.
١٦ـ جەمال نەبەز (١٩٧٦)، زمانی یەکگرتووی کوردی، یەکێتی نەتەوەیی خوێندکارانی کورد لە ئەوروپا بلاوی کردۆتەوە، بامبێرگ ـ ئەلمانیای ڕۆژئاوا.
١٧ـ دولبەر ئیبراهیم فەرەج شالی، یاسای دەنگییەکانی زمانی کوردی، نامەی ماستەر، بەشی کوردی ـ کۆلیژی زمان ـ زانکۆی سلێمانی، ٢٠٠٠ .
١٨ـ ڕەشید کورد، ڕێزمانا زمانێ کورمانجی، و : ئیسماعیل تاها شاهین، دەزگای سپیرێز، چاپخانەی خانی، دهۆك، ٢٠٠٨ .
١٩ـ ڕەفیق شوانی(د)(٢٠٠١)، چەند بابەتێکی زمان و ڕێزمانی کوردی، دەزگای چاپ و بلاوکردنەوەی موکریانی، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر.
٢٠ـ ڕەفیق محێدین شوانی(د)، ئەو وشانەی لە چاوگەوە وەردەگیرێن، دەزگای توێژینەوە و بلاوکردنەوەی موکریانی، چاپخانەی خانی، دهۆك، ٢٠٠٨.

٢١ـ ڕەفیق محێدین شوانی (د)،ئامرازی بەستنەوە لە زمانی کوردیدا، دەزگای سەردەم، سلێمانی ٢٠٠٤.

٢٢ـ زبیر بلال اسماعیل (١٩٨٤)، مێژووی زمانی کوردی، و: یوسف ڕەئوف عەلی، چاپخانەی (دار الحریه للطباعة)، بەغدا.

٢٣ـ ساموێل ئودلی رەی، زمانێ کوردی – دڤۆکێ هەکاریا – گرامەر – فەرهەنگ، و: ڕۆژان حازم، دەزگای سپیرێز، چاپخانەی حاجی هاشم، هەولێر، ٢٠٠٧ .

٢٤ـ سەلوا فەریق سالح، کاری دارێژراو لەنێوان کوردی (دیالێکتی ژووروو) و فارسیدا، دەزگای سپیرێز، چاپخانەی خانی، دهۆك، ٢٠٠٩.

٢٥ـ سعید صدقی کابان، مختصر صرف ونحوی کوردی،جزو ١، چاپخانەی نجاح، بەغدا ١٩٢٨.

٢٦ ـ سەلام ناوخۆش و نەریمان خۆشناو، زمانەوانی، بەرگەکانی(یەکەم و دووەم و سێیەم)، چاپخانەی منارە، هەولێر، ٢٠٠٩.

٢٧ـ سەلام ناوخۆش و نەریمان خۆشناو و ئیدریس عەبدوڵلا(٢٠١٠)، کوردۆلۆجی، چاپی شەشەم، چاپخانەی ڕۆژهەلات، هەولێر.

٢٨ـ سوداد ڕەسوڵ(٢٠١٢)، هەورامی لەهجەیە یان زمان؟ ، گ.زمانناسی، ژ. (١٣)، ٢٠١٢ .

٢٩ـ شێرکۆ بابان، چەند نهێنیەك لە ڕێزمانی ئامرازی پەیوەندی (ە)دا، گ.کاروان، ژ(١٥٢).

٣٠ـ صادق بهاوالدین ئامێدی، ڕێزمانا کوردی – کرمانجی یا ژۆری و ژێری یا هەڤبەرکری، چاپا یەکێ، زانکۆی سەلاحەدین، دار الشؤون الیقافیه العامه، ١٩٨٧ .

٣١ـ طاهر صادق (١٩٦٩)، ڕێنووس ـ چۆنیەتی نووسینی کوردی، چاپی یەکەم، چاپخانەی شیمال، کەرکووك.

٣٢ــ عبداللــه شـالی، ڕابــەری قوتابیــان بـۆ چـاوگ و بــۆ فرمــان، چـاپی یەکـەم، چاپخانەی(دار الجاحظ)، ١٩٧٦، بەغدا.

٣٣ــ عەبـدوڵلا حوسـێن ڕەسـول(د)، نـاکردن لەکوردیـدا نامـەی ماجسـتێر، زانکـۆی سەلاحەدین، ١٩٩١.

٣٤ـ عەبدوڵلا حوسێن رەسـول (د)، پوختەیـەکی وردی ڕستەسـازی کـوردی، چـاپی دووەم، کتێبفرۆشی سۆران، چاپخانەی منارە، هەولێر، ٢٠٠٦ .

٣٥ــ عەبـدوڵلا حوسێن ڕەسـوڵ، ئەرکـەکانی مـۆرفیمی(ە) لـە زمـانی کوردیـدا، گ. سابات، ژ(١)، ٢٠٠٥.

٣٦ـ عەبدوڵلا حوسێن ڕەسووڵ، مۆرفیمە ڕێزمانییەکانی کار، نامەی دکتۆرا، کۆلێـژی پەروەردە (ئیبن ڕوشد)، زانکۆی بەغدا، ١٩٩٥ .

٣٧ـ عەبدولسەلام نەجمەدین و سەلوا فەریق، ڕێزمانـا کـوردی بـۆ زارۆکـان، دەزگـای سپێرێز، چاپخانەی حاجی هاشم، هەولێر، ٢٠١٠ .

٣٨ـ عەفان حەمە شەریف، ئەرکی بزوێنی (ە) لە ئاستی سینتاکسدا،گۆڤاری کاروان، ٢٠٠٠ .

٣٩ـ عومـەر مـەحموود کـەریم، کـاری تێپـەڕ و تێنەپـەڕ لـە زمـانی کوردیـدا، نامەی ماجستێر، بەشی کوردی کۆلیژی پەروەردە (ئیبن روشد)ی زانکۆی بەغدا، ٢٠٠٤.

٤٠- عەبدولمەناف ڕەمەزان ئەحمـەد (٢٠٠٩)، ئەتڵەسـی زمـانی ـ هـەرێمی کوردسـتان عێـراق وەك نموونــە، نامــەی ماســتەر، بەشــی کــوردی کۆلێــژی زمــانی زانکــۆی سەلاحەدین.

٤١ـ عەبدولواحد ئەلوافی(د)(٢٠٠٧)، زانستی زمان، و:د.ئیبراهیم عەزیز ئیـبراهیم، لـە بڵاوکراوەکانی وەزارەتی ڕۆشنبیری، چاپخانەی ڕۆشنبیری، هەولێر .

٤٢ـ عومەر مەلا محەمەد ئەمین، کوردستان لەبەردەم پیلاندا، و: جەعفەر گوانی، چاپی یەکەم،چاپخانەی منارە، هەولێر،٢٠٠٤.

٤٣- عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ(د)(١٩٧١)، سەرنجێ لە زمانی ئەدەبیی یەکگرتووی کوردی، چاپی یەکەم، چاپخانەی (سلمان الاعظمي)، بەغدا.

٤٤ـ عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ(د)(٢٠٠٥)، بۆ زمان، بەڕێوەبەرێتی گشتی چاپ و بڵاوکردنەوە، چاپخانەی شڤان، سلێمانی.

٤٥ـ غازی عەلی خورشید (٢٠١٠)، زمان و زمانی ستاندارد بۆ کورد، بەشی یەکەم، ڕ. ئاسۆ، ژ (١٥٢٨)، سێشەممە ٢٠١١/٧/٩.

٤٦ــ غازی عەلی خورشید(٢٠١٢)، زمانی فەرمی بۆ کوردستان، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی.

٤٧ــ فاضل عومەر، ئاورەك د زمانێ کوردی، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠٤.

٤٨ــ فوئاد حەمە خورشید(١٩٨٥)، زمانی کوردی ـ دابەشبوونی جوگرافیایی دیالێکتەکانی، و: حەمە کەریم هەورامی، چاپخانەی (افاق العربية)، بەغدا.

٤٩– قەیس کاکل تۆفیق (د) (٢٠٠٧)، ئاسایشی نەتەوەیی و پلانی زمان، لە بڵاوکراوەکانی دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی، چاپخانەی دەزگای ئاراس، هەولێر.

٥٠ـ قەیس کاکل تۆفیق(١٩٩٥)، جۆرەکانی ڕستە و تیۆری کردە قسەییەکان،نامەی ماستەر، زانکۆی سەلاحەددین.

٥١ـ کامل حسن بصیر(د)(١٩٨٤)، زمانی نەتەوایەتیی کوردی، چاپخانەی کۆڕی زانیاری عێراق، بەغدا.

٥٢ـ ك. ك. كوردۆییێڤ، ڕێزمانی كوردی بە كەرەستەی دیالێكتی كرمانجی و سۆرانی، و: كوردستان موكریانی، هەولێر، ١٩٨٤ .

٥٣ــ لیژنەیەك لەوەزارەتی پەروەردە، زمان و ئەدەبی كوردی، پۆلی دووەمی ناوەندی، چاپخانەی ئارام، بەغدا، ٢٠٠٧ .

٥٤ــ لیژنەیەك لەوەزارەتی پەروەردە، زمان و ئەدەبی كوردی، پۆلی سێیەمی ناوەندی، چاپخانەی ئارام، بەغدا، ٢٠٠٧ .

٥٥ـ لیژنەی زمان و زانستەكان، ڕێزمانی ئاخاوتنی كوردی، كۆڕی زانیاری كورد، بەغدا، ١٩٧٦.

٥٦ـ لێژنەیەك لە وەزارەتی پەروەردە، زمان و ئەدەبی كوردی، پۆلی هەشتەمی بنەڕەتی، چاپی سێیەم، چاپخانەی (ئەكاسیا)، هەولێر، ٢٠٠٩ .

٥٧ـ لێژنەیەك لەوەزارەتی پەروەوردە، زمان و ئەدەبی كوردی، پۆلی یازدەهەمی ئامادەیی، چاپی چوارەم، چاپخانەی (مستقبل)، لوبنان، ٢٠١٠ .

٥٨ــ لێژنەیەك لەوەزارەتی پەروەردە، زمان و ئەدەبی كوردی، پۆلی دەیەمی ئامادەیی، چاپی چوارەم، چاپخانەی (مستقبل)، لوبنان، ٢٠١٠ .

٥٩ــ كەمال فوئاد(د)(١٩٧١)، زاراوەكانی زمانی كوردی و زمانی ئەدەبی و نووسینیان، گ. زانیاری، ژ (٤)، بەغدا.

٦٠ــ كەمال میراودەلی(د)(٢٠٠٧)، فەرهەنگی ڕێزمانی كوردی، لە بڵاوكراوەكانی مەڵبەندی كوردۆلۆجی، سلێمانی.

٦١ـ مەمێ ئالان، كۆكردنەوەی صالح عەلی گوللی، بەغدا، ١٩٧٧ .

٦٢ـ محەمەد عومەر عەول، دابەشبوونی كرداری لێكدراو لە ڕووی داڕشتن و ئەركەوە (لە كرمانجی خواروو)دا، نامەی ماجستێر، زانكۆی سلێمانی، ٢٠٠١ .

٦٣ـ محەمەد مەعروف فەتاح، (د)، کارو پۆلێن کردنەکانی بەپێی ڕۆنان، گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ، ژمارە (١٢١)، ١٩٨٩.

٦٤ـ محمد طاهر گوهەرزی، ڕێزمانا کوردی ـ زارێ کرمانجی، چاپخانەی خەبات، دهۆك، ١٩٩٩.

٦٥ـ مصطفی محمد زەنگنە، کار و ئەرکی لە سینتاکسدا، نامەی ماجستێر، زانکۆی سەلاحەددین،١٩٨٩.

٦٦– محەمەد ئەمین هەورامانی (١٩٨١)، زاری زمانی کوردی لە ترازووی بەراوردا، چاپی یەکەم، بەغدا.

٦٧ـ محەمەد مەحوی (د)(٢٠٠١)، زمان و زانستی زمان ـ سەرەتایەك بۆ زانستی زمان، بەرگی یەکەم، سلێمانی.

٦٨ـ محمد معروف فتاح(١٩٨٥)، هێماکاری و زمانەوانی، گ. کاروان، ژ(٢٨).

٦٩ـ محمد معروف فتاح(د)(١٩٨٦)، سنوور و بنەما و ئەرکەکانی کۆزمانەوانی، گ. ڕۆشنبیری نوێ، ژ (١١٢).

٧٠ـ محمد معروف فتاح (١٩٩٠)، زمانەوانی، چاپخانەی (دار الحکمة)، بەغدا.

٧١ـ محمد معروف فتاح(د)(٢٠٠٨)، زمانی ستاندەرد و زمانی یەکگرتووی کوردی، دەستنووس، ئەکادیمیای کوردی.

٧٣ـ محمدی خال (١٣٦٧)(١٩٨٨)، فەرهەنگی خاڵ، جزمی یەکەم، کتابفرۆشی محمدی سەقزی، چاپ اول.

٧٤ـ محەمەد محەمەد یونس عەلی(د)(٢٠١٠)، دەروازەیەك بۆ زمانەوانی، و: نەریمان عەبدوڵڵا خۆشناو، لە بڵاوکراوەکانی کتێبخانەی ئاوێر، چاپخانەی ڕۆژهەڵات، هەولێر.

٧٥ـ محەمەد مەردۆخی (١٩٩١)، مێژووی کورد و کوردستان، عەبدولکەریم محەمەد سەعید، چاپی یەکەم، چاپخانەی (اسعد)، بەغدا.

٧٦- میر شەرەفخانی بدلیسی(٢٠٠٦)، شەرەفنامە ـ مێژووی ماڵە میرانی کوردستان، و: مامۆستا هەژار، چاپی سێیەم، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، هەولێر.

٧٧ـ نەسرین فخری(د) و کوردستان موکریان(د)، رێزمانی کوردی،چاپخانەی زانکۆی سەلاحەدین، هەولێر،١٩٨٢ .

٧٨ـ نووری عەلی ئەمین، رێزمانی کوردی، چاپخانەی کامەران، سلێمانی، ١٩٦٠.

٧٩ـ نووری عەلی ئەمین، قەواعیدی زمانی کوردی، لە (صرف و نەحو)دا، بەرگی یەکەم، چاپخانەی مەعارف، بەغدا،.١٩٥٦

٨٠ـ نووری عەلی ئەمین، قەواعیدی زمانی کوردی، لە (صرف و نەحو)دا، بەرگی دووەم، چاپخانەی مەعارف، بەغدا،١٩٥٨.

٨١ـ نوری عەلی ئەمین، دەوری بزوێنی(ە) لە زمانی کوردیدا، گ(رۆشنبیری نوێ)، ژ(١١١).

٨٢ـ نەسرین فەخری(د)، پاشگری ( اندن ) لە زمانی کوردیدا، گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد، بەرگی سێیەم، بەشی یەکەم، بەغدا،.١٩٧٤

٨٣ـ نەریمان عەبدوڵڵا خۆشناو، بکەر نادیار، سەنتەری ڕوناکبیری هەتاو، هەولێر، چاپخانەی شەهاب، ٢٠٠٧.

٨٤ـ نەریمان عەبدوڵڵا خۆشناو، کاری تێپەڕ لێکۆڵینەوەیەکی بەرانبەرییە لە نێوان زمانی کوردی و زمانی عەرەبیدا، گ . کاروان، ژ. (١٩٨)، .٢٠٠٥

٨٥ ـ نەریمان عەبدوڵڵا خۆشناو، ڕستەسازی، چاپخانەی ڕۆژهەڵات، هەولێر، ٢٠١٢.

٨٦ـ نەریمان عەبدوڵڵا خۆشناو(٢٠١٠)، رێزمانی کوردی ـ بەشەکانی ئاخاوتن، چاپی دووەم، چاپخانەی منارە، هەولێر.

٨٧ـ ـ نەریمان خۆشناو، ئەرك و گریمانەکانی زمان، گ. زانکۆی نوێ، ژ.(٢٦)، تشرینی دووەم و کانوونی یەکەمی ٢٠٠٧.

٨٨ـ وریا عومەر ئەمین(١٩٨٥)، چەن زمان، ڕ.(العراق)، ژ.(٢٧٣١)، ١٩٨٥/١/٢٣.

٨٩ـ وریا عومەر ئەمین، ئاسۆیەکی تری زمانەوانی، دەزگای ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٤.

٩٠ـ وریا عومەر ئەمین (د)، ڕەخنەی ناڕەخنە، گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ، ژمارە (١٤٠)، ١٩٩٧.

**دووەم: بە زمانی عەرەبی**

٩١ـ احمد اسعد النادري(د)(٢٠٠٥)، فقه اللغة ـ مناهله و مسائله، المكتبة العربية، بيروت ـ لبنان.

٩٢ـ احمد مطلوب (د)(١٩٨٩)، معجم النقد العربي القديم، بغداد.

٩٣ـ التهامي الراجي(د)(١٩٨٦)، توطئة لدراسة علم اللغة التعاريف، بغداد.

٩٤ـ جمعة سيد يوسف (١٩٩٠)، سيكولوجية اللغة والمرض العقلي، سلسلة عالم المعرفة، الكويت.

٩٥ـ حاتم صالح الضامن (١٩٨٩)، علم اللغة، طبعة الاولى، وزارة التعليم العالي والبحث العلمي، بيت الحكمة، بغداد.

٩٦ـ ستيفن اولمان (١٩٨٦)، دور الكلمة فى اللغة، ت. كمال محمد بشير، مكتبة شباب، بغداد.

٩٧ـ على عبدلواحد وافى (د)، علم اللغة، دار نهضة، مصر، ١٩٩٠.

٩٨ـ فرديناند دى سوسور (١٩٨٨)، علم اللغة العام، ترجمة يوئيل يوسف عزيز، الموصل.

٩٩ـ فؤاد مرعي (٢٠٠٢)، في اللغة و التفكير، دار المدى للثقافة و النشر، دمشق.

١٠٠ـ محمد على الخولي(د)(٢٠٠٠)، مدخل الى علم اللغة، دار الفلاح للنشر والتوزيع، عمان ـ اردن.

١٠١ـ محمد على الخولي (١٩٩٨)، دراسات لغوية، دار الفلاح للنشر والتوزيع.

١٠٢ـ محمد حسين عبدالعزيز (د)(١٩٨٣)، مدخل الى علم اللغة، دار النمر للطباعة، القاهرة ـ مصر.

١٠٣ـ محمد علي الخولي (د)(٢٠٠٠)، مدخل الى علم اللغة، دار الفلاح للنشر والتوزيع، اردن.

١٠٤ـ محمد امين زكى (١٩٦١)، خلاصة تاريخ الكرد و كردستان من اقدم العصور التاريخية حتى الان، محمد على عونى، الجزء الاول الطبعة الثانية، بغداد.

١٠٥ـ محمد شفيق غربال (١٩٨٠)، الموسوعة العربية الميسرة، الجزء ٢، دار النهضه، لبنان.

١٠٦ـ الموسوعة العربية العالمية (١٩٩٩)، الطبعة الثانية، مؤسسة اعمال الموسوعة للنشر والتوزيع، الرياض.

١٠٧ـ نعوم تشومسكى (١٩٩٣)، المعرفة اللغوية (طبيعتها وأصولها واستخدامها)، ترجمة: محمد فتيح، الطبعة الاولى، دار الفكر العربي، القاهيرة .

**108ـ هوگر طاهر توفيق(٢٠٠٤)**، دور الصحافة الكردية في تطوير الوعي القومي الكردي ١٨٩٨ ـ ١٩١٨، دار سبيريز للطباعة والنشر، دهوك.

**سێیەم : بە زمانی ئینگلیزی**

**109 _ Bartsch, Renate (1987),** Norms of Language, Longman, London.

**110 - --------------------(1987),** Norms of Language, Longman, London.

**111 - Bell, R. (1976),** Socioliguistics: Goals, Approaches and Problems, London, Bats ford.

**112- Bussmann, H, (1996),** Routledge Dicrionary of Language and Linguistics, London and New York.
**113- Ferguson, C. A. (1996) ,** Diglossia, Repr in Sociolinguistic Perspectives, Ed by Thom Heubner, Oxford, Oxford University Press.
**114- Garvin, Paul (1975),** Selected papers on Language planning. State University of New For k.
115- ---------------(1973). "Some comments on language planning", in Language planning: current Issues and Research, eds, j. Rubin and R. Shuy, Georgetown University press, Washington Dc.
**116- Guxmam, m. m(1968),** Some general regularities in the formation and develop ment of national language, in J. Fishman (ed), Reding in the Sociobgy of Language, the Hage, Mouton.
**117- jukil, Ali Mahmood (2004),** The process of standardization with reference to Englishand Kurdish languages. P.H.D., University of Salahadin, Erbel..
**118 - Hall, R. A. (1972),** podgins and creoles as Standard Languages, Britain.
**119- Haugen,Ener(1966),** Dialect, Language, Nation, American Antlropologist, Vol. 68 , No. 6.
**120 -------------- (1972),** Great Britain, Hazell watson viney Ltd.
**121 --------------- (1994),** Standardization, the Encyclopedia. Of language and Linguistics Vol, Great Britain.
**122- Hassan Pour, Amir (1992),** Nationalism and Language in Kurdistan, 1918 – 1985, P.H.D., Mellen Research University press, San Francisco.

123. **Hudson R. A (1980),** Sociolinguistics. Cambridge University press Cambridge.
124- **Janson, T. and Joseph Tsonope (1991),** Birth of a National Language, England, Athenaeum Press.
125. **Larson, K. A. (1985),** Learning without lessons. Socialization and Language change in Norway, University press of America.
126. **Lodge, R. A. (1993),** From Dialect to Standard, Routedge,.
127. **Martin StrohMeier (2003),** Crucial image in the Presentation of Kurdish National identity, Bril, Leiden – Boston.
128- **Milrg, J. and Milaroy(1985),** Authority in Language, London.
129- **Ray, P. S (1963),** Language Standardization, The Hague, Muton.
130 **-------------(1968),** Language Standardiziation, Readings in the Sociology of Language, Ed by J. A. fishman, The Hague, Mouton.
131 **------------- (1986),** Language Standardization, Mouton.
132- **Wardhaugh, R. (1986),** An Introduction to Sociainguistics, Great BritainL T. j . press Ltd. Padstow.

**چوارەم: بە زمانی فارسی**

133- **احمد سمیعی** ۱۳۷۸(۱۹۹۹)، نگارش و ویرایش، تهران.
134- **پرویز ناتل خانلری** ۱۳۷۳(۱۹۹٤)، زبان شناسی و زبان فارسی، چاپ ششم، تهران، توس.

135ـ **پیتر ترادگیل** ۱۳۷٦(۱۹۹۷)، زبان شناسی اجتماعی، ترجمة طباطبایی، تهران، اگاه.
136ـ ———— ۱۳۷٦(۱۹۹۷)، در امدی بر زبان و جامعه، ترجمەی محمد طباطبایی، مؤسسته انتشارات اگاه، چاپ اول، تهران.
137ـ **جورج یول** ۱۳۸٥(۲۰۰٦)، بررسی زبان (ویراست سوم)، ترجمەی علی بهرامی، انتشارات رهنما، چاپ اول.
138ـ **خسرو فرشیدورد** ۱۳٦۳(۱۹۸٤)، درباره ادبیات ونقد ادبی، ۲جلد، تهران، امیر کبیر.
139ـ ———————— ۱۳۸۰(۲۰۰۱)، لغت سازی و وضع وترجمة اصطلاحان علمی و فنی، تهران، سازمان تبلیغات اسلامی، حوزة هنری.
140ـ **صادق کیا** ۱۳۳۸(۱۹٥۹)، در ایران فقط یك زبان وجود دارد، روزنامه کیهان، دوشنبه ۱۸ی بەمن.
141ـ **علی اشرف صادقی** ۱۳٦۲(۱۹۸۳)، زبان معیار، نشر دانش.
142ـ ———————— ۱۳۷٥(۱۹۹٦)، زبان معیار ـ درباره زبان فارسی، زیر نظر نصرالله پورجوادی، تهران، مرکز نشر دانشگاهی.
143ـ **علی محمد شناسی** ۱۳۷۲(۱۹۹۳)، در جستجوی زبان علم، مجموعه مقالات سمینار زبان فارسی و زبان علم، زیر نظر علی کافی، تهران، مرکز نشر دانشگاهی.
144ـ **فاختە زمانی**(۲۰۰۸)، سخنرانی در نشست کمیسیون عالی حقوق بشر سازمان ملل متحد در خصوصی مسائل اقلیتهای ملی، اتنیکی مذهبی و زبانی، سایت (اخبار روز)، ۱۹ی دیسامبەر ۲۰۰۸.
145ـ **میر جلال الدین کزازی** ۱۳۷٦(۱۹۹۷)، پرنیان پندار، روزنه، تهران.

**146ـ ناصر قلی سارلی** ١٣٨٧(٢٠٠٨)، زبان فارسی معیار، انتشارات هرمس، تهران، چاپ اول.

**147ـ یحیی مدرسی** ١٣٦٨(١٩٨٩)، در امدی بر جامعه شناسی زبان، تهران، مؤسسه مطالعات وتحقیقات فرهنگی.

